پەیامەکانی گەنجان ٢٣

زنجیرەی ئەخلاقناسی ٣






ئیکرام کەریم

# فەلسەفەی بالاپۆشی

## بەرنامەیەك بۆ بالاپۆشین




پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان

# فەلسەفەی باڵاپۆشی

## بەرنامەیەك بۆ باڵاپۆشین

نوسینی : ئیکرام کەریم



## زنجیرە کتێبەکانی گۆڤاری ڕێنوێن

- ناوی کتێب: فەلسەفەی باڵاپۆشی، بەرنامەیەك بۆ باڵاپۆشین
- نوسینی: ئیکرام کەریم
- ناوی زنجیرە: زنجیرەی ئەخلاقناسی
- ژمارەی زنجیرە: سێ
- تیراژ : ١٠٠٠ دانە
- نۆبەی چاپ: یەکەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٤
- ژمارەی لاپەڕە : ١٦٠لاپەڕە
- دیزاین : گۆڤاری ڕێنوێن
- چاپ : چاپخانەی ڕێ نوێ
- سەرپەرشتیکار : سەرکۆ کریم احمد
- ئیمەیل: renwen٢٠٠٩@yahoo.com
- ماڵپەڕ: www.aubyc.com

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی ( ١٣٤٤ )ی ساڵی ٢٠١٤ ی پێدراوە

<u>ئەم بەرهەمە تەعبیر لە بۆچونی نوسەر دەکات</u>

ئەم نامیلکەیە سێ بەشە:

بەشی یەکەم

بالأپۆشی و فەلسەفەی بالأپۆشی

بەشی دووەم

وەلامی هەندێ گومان لەسەر بالأپۆشی

بەشی سێیەم

بەرنامەیەك بۆ بالأپۆشین

## بەشی یەکەم

## بالاپۆشی و فەلسەفەی بالاپۆشی

ئەم بەشە سێ بڕگەیە:

بڕگەی یەکەم/ بالاپۆشی لەڕووی زمان و شەریعەتەوە.

بڕگەی دووەم/ فەلسەفەی بالاپۆشی و سوودەکانی

بڕگەی سێیەم/ مەرجەکانی حیجاب و زیانەکانی بێ حیجابی

## بەشی دووهەم

## وەلامی هەندێ گومان لەسەر بالاپۆشی

ئەم بەشەش سێ بڕگەیە

بڕگەی یەکەم / گومان لەسەر تەفسیری ئایەتەکانی حیجاب .

بڕگەی دووهەم/ گومان و شەرحی حەدیسەکانی حیجاب

بڕگەی سێیەم / وەسوەسەکانی شەیتان:

- دڵ حسێبە.
- چەند حیجابلەبەر هەیە زۆر خراپن.
- حیجاب کەلتورو خووە.
- مۆدێلەکانی حیجاب.
- حیجاب هەستی سێکسی خەفە ئەکات.

❖ بێحیجابی کوڕان و پیاوان دائەمرکێنێتەوە .

## بەشی سێیەم

## بەرنامەیەك بۆ حیجابکردن

ئەم بەشەش سێ برگەیە :

بڕگەی یەکەم/ چاندنی چەند قەناعەتێکی فیکری.

بڕگـــەی دووەم/ هەڵســـەنگاندنێك لـــەنێوان حیجـــاب و بێحیجابیدا.

بڕگەی سێیەم/ چەند هەنگاوێك بەرەو حیجابکردن.

بسم الله الرحمن الرحیم

**خـوای گـەورە ئەفـەرموێت:** (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا) **٥٩/الاحزاب**

**واتــە ئــەی پێغەمبــەر! بەژنــەکانت و بەکچــەکانت و بەئافرەتانی ئیمانـدار بڵـێ:باجلوبەرگـەکانیان تـاخوار بـدەن بەخۆیاندا(و بالآپۆشی بکەن)، ئەم خۆداپۆشینەیان(لەهەموو شــت باشـتر)و نـزیکترە تابیانناسـێنێ بەکۆمەڵگـە کەئەمانـە بەشــوێن داوێنپاکیــەوەن، خــوای گــەورەش لێبوردەیــە(بــۆ ئەوانــــەی تائێســــتا بالآپۆشــــیان نــــــەکردووە)و بەسۆزیشە(بەرامبەر هەموو ئەوانەی بالآ پۆشن).**

## پێشەکی

لەکاتی گەرمای هاویندا بوو، برایەك باسێکی حیجابی کردو بەپێویستی زانی لە دووتوێی نامیلکەیەکدا یاسای بالآپۆشی و فەلسەفەی ئەم حیجابە ئیسلامیە باسبکرێت بۆ ئافرەتانی ئەم هەرێمە.. منیش ووتم: باشە خۆ بازاڕ پڕیەتی لەکتێبی ئیسلامی و هەریەکەشیان لەگۆشەیەکەوە باسی ئەم بالآپۆشیە ئەکەن، ووتی: من بەباشی ئەزانم کە تۆ لەسەری بنوسی، چونکە من وەك خاوەنی کتێبخانەیەك ئاگادارم ئافرەتێکی زۆر ڕوویانکردبووە ئەو کتێبەت کە لەسەر نەزەرکردن نوسیبووت و هەرزوو نوسخەی لەبازاڕدا نەما، بۆیە پێمباشە بەو شێوازە لەسەر حیجابیش بنوسی، منیش بەدڵی ئەوەمکردو بڕیارمدا کە نامیلکەیەکی کورت بنووسم لەسەر بالآپۆشی، سەرەتا بیرم لەوەرگێڕانێك کردەوە، چونکە هەم زوونەدات بەدەستەوەو هەم ئەرکی گەڕان و ساغکردنەوەت لەکۆڵئەکاتەوە، بەلآم کتێبێکی گونجاوم دەستنەکەوت کە قەبارەی بچوك بێت و ڕەنگ و بۆی ولآتانی تری هەڵنەگرتبێت و بۆ کۆمەڵگەی ئێمەش شتێکی عەمەلی بێت،

بۆیــە لەکۆتاییــدا هاتمــە ســەر ئــەو قەناعەتــەی کەباسـێکی خۆماڵی کورت و پوخت لەسـەر بالآپۆشـی بنووسـم و بیکەمـە سێ بەشـی سـەرەکی: بەشـی یەکـەم: بالآپۆشـی و فەلسـەفەی بالآپۆشی.

بەشی دووەم: وەلآمی هەندێ گومان لەسەر بالآپۆشی.

بەشی سێیەم: بەرنامەیەك بۆ حیجابکردن..

بۆیــە بەوشـێوەیەش دابــەشمکرد چـونکە قەناعەتموایــە کـەئافرەتێکی زۆری خـاوەن دیـن هەیـە و تـا ئێسـتا بڕیـاری نەهاتوەتــە ســەر ئــەوەی حیجـاب بپۆشــێ! ئـیتر یـان لەبـەر ئەوەیـە نـازانێ یـان ئـەزانێ بـەلآم نـاتوانێ، یـان ئەشـزانێ و ئەشتوانێ بەلآم ناوێرێ !!

نــاوێرێ: چــونکە ئەترســێ پێــی هەڵنــەگیرێ، لەماڵــەوەو لەخزمانـەوە هاوکـاری نـەکرێت، ئەمـەش جۆرێکـە لـەلاوازی ئـیرادەو لاوازی دڵ، ئەوکەسـانە پێویسـتیان بـەوە هەیـە کـە زاتیـان بخرێتەبـەر، بڕیاریـان بخرێتەسـەر، ئـەمادار بکـرێن، زانیاریـان پێبـدرێت، بـەڵکو ئەمــە خوایـە ئـازابێ و چـاو لەچاکان بکات و ئەوەندە کۆڵ بەتانەوتەشەرەوە هەڵنەگرێ و ڕوو لەپەروەردگاری بکات و لەخەڵوەتێکدا کە جگە لەخۆی و

خوای پەروەردگاری نەبێت کەس لەگەڵیان نییە کوڵێک بیگرێت و بەدڵ هاوار لەخوا بکات و بڵێ: خوای پەروەردگار! خۆت ئاگات لەدڵم هەیە، من زۆر حەز بەبالاپۆشی ئەکەم، ویژدانم ئازارمئەدات بەبێ حیجاب ئەچمەدەرەوە.. دەی خوایە! بەهێزمبکەو یارمەتیمبدەو لەم لاوازیە ڕزگارمبکە، لەلای خۆتەوە چەند هاوکارو پشتیوانێکم بۆ پەیدابکە کە لەم بڕیارەمدا پشتمبگرن و باخی ئیمانم پەرژین بکەن .. خوایە بمبەخشە لە کەموکورتیەکانم ئەی بەخشندەی بەسۆز...

خوایە ئەم نووسینەی کە ئەم عەبدە هەژارەی تۆش نووسیویەتی پڕبکە لەبەرەکەت و کاریگەری، ئەی سەرچاوەی بەرەکەت و کاریگەری! صەلات و سەلامی خۆشت ئەوەندە بڕژێنە بەسەر پێغەمبەردا کە شایان بەو هەموو ڕەنج و زەحمەتە بێت کە کێشای بۆ ناساندن و سەلماندن و پەرژینکردنی ئەم باخی دینە ..

ئیکرام کەریم

سلێمانی شەوی ٢٠١١/٦/٣٠ سەعات١:٤٥

## بەشی یەکەم

## بالآپۆشی و فەلسەفەی بالآپۆشی

**بڕگەی یەکەم / بالآپۆشی لەڕوانگەی زمان و لەروانگەی شەریعەتەوە**

بالآپۆشیمان بۆ ووشەی حیجاب بەکارهێناوە، کە لای هەموو کەسێکی کورد یانی لەبەرکردنی بەرگێك لەلایەن ئافرەتانەوە کە هەموو لەشی دابپۆشێت دەست و دەم و چاوی نەبێت .

ووشەی حیجاب لەزمانی عەرەبیدا واتە: پەردە ، یان چارشێو، عەرەب ئەڵێن: حجب الشيء يحجبه: حجباً، وححجاباً: اي ستره وقد احجب وتحجب: اذا اكتن من وراء حجاب.

هەر شتێك کەبکەوێتە نێوان دوو شت بەو شتە ئەوترێ:(حیجاب) یانی پەردە، بەربەست، واتە: هەرشتێك ڕێگەت لێبگرێ و نەیەڵێت بگەی بەمەبەستی خۆت ئەو شتە ناوی (حیجابە)، قورئان بەم مانایە ووشەی حیجابی بەکارهێناوە وەك ئەفەرموێ:﴿ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ﴾، یانی: لەنێوان هەردوولایاندا پەردەو ڕێگرێك هەیە،هەروەها

ئەفـەرموێ: ﴿وَمِنْ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ﴾، واتـە: كافرەكـان بـە پێغەمبەریان ئەووت : لەنێوان ئێمەو ئێوەدا پەردە هەیە.

لەروانگەی شەریعەتیشـەوە حیجـاب بریتییەلـە: ئـەو جلوبەرگـەی كـەجوانی ئـافرەتی موسـوڵمانی ئـازادی بـاڵغی عاقڵ ئەشارێتەوە لەنامەحرەم، خوای گەورە ئەفـەرموێ: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾،یـانی: بـاجوانی خۆیـان(لـەلای نامەحرەمـدا) دەرنەخـەن ئـەوە نـەبێت كەخۆی دەرئەكـەوێت (واتـە: دەسـت و دەم و چـاو)، بەپێی تەفسـیری پێغەمبـەری خواو صەحابە و زانایانی ئیسلامی.

- لەقورئانـدا ئایـەتی: ﴿(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا)، (٥٩: الاحـزاب) بەئایـەتی حیجـاب بەناوبانگـە كـەخوای گـەورە لـەو ئایەتـەداو لەسـەر زمـانی پێغەمبــەر(صــلی اللهعلیەوالەوســلم) فەرمانئـــەكات بــە(خێزانــەكانی پێغەمبــەر)و (كچــەكانی)و ( ئافرەتــانی موســڵمان و ئیمانــدار) كــەخۆیان داپۆشــن بەڕادەیــەك كەجوانیـەكانیان بشـارنەوە لەنامـەحرەم و نەبنـە فیتنـەو تاقیكردنەوە بۆ هیچ كەسێك.

• لەقورئاندا لەچەند شوێنێکدا ئەم چەمکە ئیسلامیە دووپاتکراوەتەوە وەك ئەفەرموێ : ﴿وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ﴾ النور/٣١ )

یانی: بڵێ بەئافرەتانی ئیماندار باچاویان لەئاست نامەحرەمدا دابخەن و شەرمگەشیان بپارێزن و جوانیەکانیان دەرنەخەن ئەو شتانە نەبێت کە بەناچاری دەرئەکەون لێیانەوە، بائەوەش ئەرکیان بێت کە سەرپۆشەکانیان بهێننەوەو بیدەن بەسەر درزی کراسەکانیاندا.

دایکمان عائیشەش رەزای خوای لێبێت ئەفەرموێ : ڕەحمەتی خوا لە ژنە کۆچەرییە سەرەتاکان بێت (چەندە بەدین بوون) هەرکە ئایەتی: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ﴾ دابەزی خێرا کۆڵەوانەکانیان دڕی و کردیان بەسەرپۆشی سەریان!!

• صەفییەی کچی شەیبەش ئەڵێ : ئێمە لای عائیشە دانیشتبووین -خوا لێی ڕازیێت- باسی فەزڵی ژنانی قورەیشی بۆ ئەکردین، ووتی: ڕاستە ژنانی قورەیش خاوەن فەزڵن، بەلآم سوێند بەخوا من تائێستا باشتر لەژنانی

ئەنسارم نەدیووە، کەسم وەك ئەوان نەدیووە ئەوەندە باوەڕی بەقورئان پتەوبێت و بەوشێوەیە خێرا جێبەجێیبکات، کاتێك ئایەتی: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ لەسورەتی نوور دابەزی و پیاوەکانیان چوونەوە بۆ ماڵەوەو خوێندیانەوە بۆ ژن و خوشك و کچەکانیان، یەکسەر هەستان پۆشینە والآکانیان لە سەرو سنگیان توندکرد بۆ سەلماندن وجێبەجێکردنی پەیامەکەی خوا، کاتێك هاتن بۆ نوێژ وەك ئەوەی قەلەڕەشیان بەسەرەوە بێت. ئەبوداود بەچەند ڕێگەیەك ڕیوایەتیکردووە لەصەفییەی کچی شەیبەوە.

برگەی دووهەم

فەلسەفەی بالآپۆشی و هەندێك لەسوودەکانی

هەندێ کەس ئەپرسێ: باشە بۆچی خوای گەورە فەرزیکردووە لەسەر ئافرەت کەحیجاب بکات و بەبێ حیجاب نەچێتەدەرەوەو لەلای نامەحرەمدا ئەندامەکانی لەشی خۆی دەرنەخات دەست و دەم و چاوی نەبێت؛ ئەی بۆچی ئەو بڕیارەی بۆ پیاوان-بۆ نمونە- نەداوە؟

زانایان هەریەکەو لەگۆشە نیگایەکەوە باسیان لەفەلسەفەی حیجاب کردووە، هەندێکیان لەو گۆشەیەوە سەیریانکردووە کە چەند ئایەت و حەدیسی لەسەر هاتووە کە حیجابیان فەرزئەکات و ئەوەش دیارە بەرژەوەندی عەبدی تێدایەو خوا مەبەستی بەو فەرمانانە پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەم مرۆڤەیە بەپیاوو ژنەوە.

هەندێکیشیان لەو گۆشە نیگایەوە سەیری مەسەکەی کردووە کە: ئەگەر ئافرەت حیجاب نەپۆشێ چەندێك زیان بەخۆی و چواردەورەکەی ئەگەیەنێت و ئەبێتە فیتنە بۆ خۆی بۆ چواردەورەکەی.. بۆ ئەوەی وێنەی مەسەلەکە تەواو روونبێت لەبەرچاومان ئێمە لەهەردوو گۆشە نیگاکەوە بۆ مەسەلەکە ئەڕوانین و باسی لێوەئەکەین :

گومان لەوەدا نیە کەئافرەت کائینێکی سەیرە، زوو سەرنجی بەرانبەرەکانی ڕائەکێشێ، هێزێکی کەمەندکێشی تێدا خولقێنراوە با کەمخولقیش بێت هەر ڕەگەزی بەرامبەر کێشئەکات بۆلای خۆی، خۆ ئەگەر لەنجەو لارکەر بێت و دەست بەخۆیدا بهێنێت و مەبەستی بێت ڕەگەزی بەرامبەری ڕابکێشێت بۆ لای خۆی ئەوە هەرچۆن بیەوێت وا

ئاراستەیئەکات و چەند دەرەجە بیەویٚ بەویستی خۆی ئەیسوڕیٚنیٚت!

خوای گەورە هەروا لەخۆڕایی ئەو هیٚزی کیٚشکردنەوەی بەمرۆڤی میٚیینە نەداوە، بەڵکو بۆ ئەوە پیٚیداوە تا لەناو نازو خۆشەویستیدا گەشەبکات، لانەیەکی نەرم و گەرم بۆ هاوسەرو منداڵەکانیشی سازبکات، کە نەك بشیٚوی نەنیٚتەوە، بەڵکو بەردەوام ئاگری تورەیی و بشیٚوی و من و تۆیی بکوژیٚنیٚتەوە..

مرۆڤی میٚینە ئەبیٚ ئەو جوانی و خاڵە بەهیٚزانەی تیٚیدایە بەکاریاننەهیٚنیٚ بۆ جگە لەمەحرەمەکانی خۆی، چونکە ئەوە وەك بەکارهیٚنانی ئاگر وایە بۆ سوتاندن و ویٚرانکاری نەك سوود گەیاندن و بەدەستهیٚنانی پیٚویستیەکان..

ئافرەتیٚك بیەویٚت بەبەکارهیٚنانی ئەو کارتانەی کە خوا پیٚیداوە لەجوانی و خویٚنشیرینی و خوڵقخۆشی و کانیاوی عاتیفە بگاتە چەند مەرامیٚکی نادرووست، خوای گەورە لیٚی زوویرئەبیٚت و بەرەکەتی خۆی لیٚئەگریٚتەوە و

ئەیداتــــــە دەســـــــت ئارەزووەکـــــانی خـــــۆی و رووی لێوەرئەچەرخێنێت !!

خوای گەورە ئەفەرموێ ﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى﴾، نێ‌ ‌ینە وەك مێینــە نییــە، ئــافرەت لەدەنگیــدا، لــەڕەنگی پێســتیدا، لەفۆڕمی دەرەوەیدا، لەناخ و دەروونیدا، لەهەست و خولیاو خەیاڵیدا، لەحەز و ئارەزووەکانیدا وەك پیاو نییە..

پیــاو ئەگــەر دەیــان ســیفەتی باشــی ئــافرەتی بــۆ هەڵبـدەی بـۆ ئـەوەی بیخوازێـت نایـەوێ ئەگـەر جوانیەکـەی سەرنجی ڕانەکێشێ!! بەڵام ئافرەت وانیە بۆ پیاو، دەیان جار جــوان بێــت ئەگــەر کەســایەتی بــەهێز نــەبێت ئــەوە لاشــی لێناکرێتەوە.

پیـاو بەجوانی ئـافرەت سەرسامئەبێت و زیـاتر بـەو تەڵەیــەوە ئــەبێت، هــەر بۆیــە ئافرەتــان بــەردەوام دەســت بەخۆیانـدا ئـەهێنن و پارەی دونیـا لەخشڵ و کەرەستەکانی جوانکاریــدا بــەکاردەهێنن، ئــافرەتیش بەکەســایەتی پیــاو سەرســامئەبێت هــەر بۆیــە پیــاوانیش بــەردەوام لــەخولیاو خەیاڵی پلەوپایەی زانستی و دنیایدان و هەوڵ ئەدەن لەو بوارەدا کێبڕکێ بکەن.

بالاپۆشی بۆ ئەوەیە کەجوانی ئافرەت بشارێتەوە لەنامەحرەم بۆ ئەوەی هەم ئافرەت بپارێزێ لەگورگە برسیەکانی پێش زەواجکردن و هەم داهاتووی ئافرەتیش دابینبکات و بیپارێزێت پاش زەواجکردنی، چونکە ئەو ئافرەتەی گوێ بەحیجاب نادات و خۆی و جوانیەکەی بۆ نامەحرەم دەرئەخات گریمانی زۆری هەیە کەپیاوێك بخاتە داوی خۆیەوە، دووریش نیە ئەو پیاوە دەستگیراندار بێت یان خاوەن ژن بێت، بەو شێوەیە ئەم ئەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەو گرێ پیرۆزەی هاوسەرگیری کە ئەو پیاوە لەگەڵ ژنەکەیدا هەیەتی یان لەگەڵ دەستگیرانەکەیدا هەیەتی... ئەگەر ئەوەش ڕوونەدات ئەوە یان ئەو پەیوەندی و گرێبەستە لەرزۆك و لاوازئەکات و گەرم و گوڕی جارانی ناهێڵێ یان بەگریمانێکی زۆر ئەو پیاوە تووشی ناپاکیکردن و خیانەتی زەوجی ئەکات و بەو شێوەیە لانەی گەرمی ئافرەتێکی وەك خۆی تێکئەدات و ئەوەش کارێکە ئەبێت خۆشی پاش زەواجکردن باجی ئەو کارەی بدات و ئافرەتێکی تر کە هەڵدەگرێ لەم جوانترە یان لەم گەنجترە، یان مەکربازو فریودەرە.. مێردەکەی ئەم یان دەستگیرانەکەی

ئەخاتە داوی خۆیەوەو تووشی ئەو دوو گریمانەی ئەکات کە پێشتر باسمانکرد(دڵساردکردنەوەی لەژنەکەی یان خیانەی زەوجی)..

ئەمەیە ئەڵێن : فەلسەفەی حیجاب بۆ پاراستنی ئافرەتە پێش زەواج و پاش زەواجیش ، بۆ پاراستنی ئێستا و پاراستنی دوا ڕۆژی ئافرەتە بە پلەی یەکەم ..

بەئەزموونیش دەرکەوتووە کە ناپاکیکردن و شەرەفشکاندنی خەڵکی قەرزە بەسەر ئەو کەسەوە کەبێسڵەمینەوە پەیوەندی نامەشروع دروستئەکات و ئەوەش ئەو باجە ئەبێ بدات هەر ئەو کەسە خۆیەتی!

ئیمامی شافعی چەند جوان ئەفەرموێت:

عفوا تعف نساؤكم في المحرم .. وتجنبوا ما لا يليق بمسلم

إن الزنا دين فإن أقرضته... كان الوفاء من أهل بيتك فعلم

من يَزْنِ يُزْنَ به ولو بجداره ... إن كنت يا هذا لبيبا فافهم

يا هاتكا حرم الرجال وقاطعاً .. سبل المودة عشت غير مكرم

لو كنت حراً من سلالة آدم ... ما كنت هتاكا لحرمة آدم[1]

---

[1] یانی:خۆتان پاکڕاگرن، ژنەکانیشتان خۆیان لەماڵەوە پاکڕائەگرن..دووربکەونەوە لەو شتانەی شایستەنین بەموسڵمان.:زیناکردن قەرزە ئەگەر کردت، ئەبێ خێزانەکەت بۆت

حیجابکردن دەیان سوودی تری هەیە جگە لەم سودە گەورەیەی کەباسمانکرد بۆ نمونە :

١-حیجابکردن نیشانەی بڕوابوونە بەخواو ڕێزگرتنە لەشەرع، دیارە ئەمەش کەم نیە، بەڵکو شتێکی جەوهەری سەرەکیە لە دنیادا، خوای گەورە ئەفەرموێ:(مَنْ يُعَظِّمْ حُرُمَاتِ اللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ عِنْدَ رَبِّهِ)، واتە: ئەوەی ڕێز لەسنوورەکانی خوا بگرێت ئەوە بۆ لای خوای باشە، (کاتێك ئەگاتەوە بەپەروەردگاری لەقیامەتدا).

٢-حیجابکردن پارێزگاری لەجوانی پێست و بەژنی ئافرەت ئەکات و نایەڵێ تینی خۆرو هەوای ئالودە چرچ و قرچی بکات.

بدەنەوە ئەو باش بزانە، هەرکەس زینابکات زینای لەگەڵدا ئەکرێت ئەگەر لەگەڵ دیواری ماڵەکیشیدا بووە،ئەگەر خاوەنی ئاوەزی ئەوە باش بزانە، ئەی ئەوەی ناموسی خەڵکی ئەشکێنی و ڕێگەلەسەرزبوونی خۆشەویستی ئەگری، دڵنیابە تامەی ژیانێکی بێڕێزانە ئەبەیتەسەر، ئەگەر کەسێکی ئازادو نەجیب بویتایە ئەوە بەدڵنیاییەوە ئابڕووی هیچ مرۆڤێکت نەئەبرد.

٣-حیجابکردن قژی ئافرەت لەمووخۆرکەو وشکهەلآتن ئەپارێزێت و تەڕی و ناسکیەکەی ئەهێڵێتەوە بۆ ماوەیەکی درێژتر[٢].

٤-حیجابکردن خوای پەروەردگار ڕازی ئەکات و بەو هۆیەشەوە خوای گەورە ئەو کەسە حیجابدارە لەناو دۆستانی خۆیدا تۆمارئەکات و بەرگریلێئەکات و ئەیپارێزێت لەهەڵوێستەکانی ژیانیدا، خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ (٣٥) مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ ئایا کەسێك مل کەچبکات بۆ پەیامی ئێمەو کەسێك یاخی ببێت لە پەیامی ئێمە وەك یەك سەیریان دەکەین، ئەو چ حوکمێکە ئێوە دەریدەکەن؟!.

پێغەمبەریش (صلی اللهعلیهوالهوسلم) ئەفەرموێ («إِذَا أَحَبَّ اللهُ العَبْدَ نَادَى جِبْرِيلَ: إِنَّ اللهَ أَحَبَّ فُلَانًا فَأَحِبَّهُ، فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، فَيُنَادِي جِبْرِيلُ فِي السَّمَاءِ: إِنَّ اللهَ قَدْ أَحَبَّ فُلَانًا فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ ثم يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي أَهْلِ الْأَرْضِ».خوای پەروەردگار ئەگەر عەبدێکی خۆشویست بانگی جوبریل ئەکات دڵنیابن کەخوا

[٢] بۆدرێژی ئەم باسە سەیری کتێبی(الحجاب و تأثیره علی صحة و سلامة الشعر: د.محمد ندا ) بکە.

فلانەکەسی خۆشئەوێت، ئێوەش خۆشتانوێت! خەڵکی ئاسمانەکان هەموو خۆشیان ئەوێت، پاشان ئەکرێتە جێگەی قەبوڵی خەڵکی زەمینیش، دیارە ئەم سوودەش کەم نیە!.

٥-خوای گەورە ئافرەتی حیجابلەبەر ئاسودە ئەکات، دڵخۆش و بەقەناعەتی ئەکات، ئەم دڵخۆشی و قەناعەتەش ئەبێتە خۆراکی رۆح بۆی .

٦-حیجابکردن جۆرە شەرمکردنێکە، پێغەمبەر (صلی اللەعلیەوالەوسلم) ئەفەرموێ (مَا كَانَ الفُحْشُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ شَانَهُ، وَمَا كَانَ الحَيَاءُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ زَانَهُ.)[٣]، سنووربەزاندن بچێتەناو هەر شتێك ناشیرینیئەکات و شەرمیش بچێتەناو هەر شتێك جوانی ئەکات، لەڕیوایەتێکی تردا ئەفەرموێ (إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ خُلُقًا، وَخُلُقُ الْإِيمَانِ الْحَيَاءُ)[٤]، لەڕیوایەتێکی تردا ئەفەرموێ:( الحياء خيرٌ كله )[٥]، شەرمکردن هەموو گیانی هەر خێرە ... ئیبن عومەر ئەفەرموێ:«إِنَّ الْحَيَاءَ وَالْإِيمَانَ قُرِنَا جَمِيعًا، فَإِذَا رُفِعَ أَحَدُهُمَا رُفِعَ

[٣] سنن الترميذي، رقم الحديث: ١٩٧٤

٤ مصنف ابن ابي شيبة: رقم الحديث: ٢٥٣٥٢

٥ سنن ابي داود، رقم الحديث: ٤٧٩٦

الْآخَرُ»[٦] شـەرم و ئیمـان هـاوەملی یـەکترکراون، ئـەمیان فـڕی ئەویتریشیان لەگەڵیدا ئەفڕێت.

٦ مصنف ابن ابي شيبة: رقم الحديث: ٢٥٣٥٠.

## بڕگەی سێهەم

## مەرجەکانی حیجاب و زیانەکانی بێحیجابی

مەرجەکانی حیجاب بەکورتی بریتین لەو جلەی کە جوانی ئافرەت بشارێتەوە لەنامەحرەم، ئیتر ئەو جلە کوردی بێت، یان عەرەبی بێت، یان جلی میللەتی ئەفریقی بێت یان ئەوروپی بێت...

هەر جلێك ببێتە هۆی دەرخستنی جوانی ئافرەتان بۆ نامەحرەم ئەوە حیجابی شەرعی نییەو کەم و کورتیەکی تێدایە، ئیتر ئەو جلە کوردی بێت یان عەرەبی بێت یان جلی میللەتانی ئەفریقی یان ئەوروپی بێت...

زانایانی ئیسلامی لەژێر رۆشنایی ئایەتەکانی قورئان و سوونەتەکانی پێغەمبەردا(صلی اللەعلیەوالەوسلم) مەرجەکانی پۆشاکی ئیسلامیان کۆکردووەتەوە لە پێنج مەرجی سەرەکیدا وەك ئەفەرموون: حیجابی ئیسلامی پێویستە ئەم مەرجانەی خوارەوەیان تێدا بێت :

١-هەموو لەشی دابپۆشێت دەست و دەم و چاوی نەبێت.

٢-بەرگەکە لەزاتی خۆیدا زینەت و جوانی نەبێت وەك بەرگی ڕەنگاو ڕەنگ(بریق و باق).

بەلاّم رێگر لەوەدا نیە کە رەش بێت یان سەوزبێت یان هەر رەنگیکی تر بێت، ئیمامی بەیهەقی لەعائیشەوە ئەگێرێتەوە کەئافرەتێك هاتەلای سەرپۆشەکەی سەوزبوو،(أَنَّ امْرَأَةً دَخَلَتْ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا وَعَلَيْهَا خِمَارٌ أَخْضَرُ)[7]، ئیمامی سیوتیش ئەم فەرموودەی هێناوە کە ئافرەتێك هاتەلای عائیشە کراسەکەی و سەرپۆشەکەشی سەوزبوون، ئەوەتا ئەفەرموێ:( جِلْدُهَا أَشَدُّ خُضْرَةً مِنْ ثَوْبِهَا، وَعَلَيْهَا خِمَارٌ أَخْضَرُ)[8].
سەکینە ئەلێ:«دَخَلْتُ مَعَ أَبِي عَلَى عَائِشَةَ فَرَأَيْتُ عَلَيْهَا دِرْعًا أَحْمَرَ، وَخِمَارًا أَسْوَدَ»[9]، لەگەلّ بوکمدا چووینە لای عائیشە کراسێکی سوورو سەرپۆشێکی رەشی بەسەرەوە بوو.لەسوونەنی ئەبو دوادا رەنگی زەردیشی باسکردووە و شێخ ئەلبانی فەرموودەکەش بەصەحیح دائەنێت.[10]

---

٧ سنن البيهقي

[8] مُخْتَصَرُ النَّصِيحُ فِي تَهْذِيبِ الْكِتَابِ الْجَامِعِ الْصَّحِيحِ، المهَلَّبُ بنُ أَحْمَدَ بنِ أَبِي صُفْرَةَ أَسِيْدِ بنِ عَبْدِ اللهِ الأَسَدِيُّ الأَنْدَلُسِيُّ،المحقق: أَحْمَدُ بْنُ فَارِسٍ السَّلوم، رقم الحديث١٢٥٤)

[9] الكتاب المصنف في الأحاديث والآثار، أبو بكر بن أبي شيبة، المحقق: كمال يوسف الحوت، (٥/١٦٠)، رقم الحديث:٢٤٧٤٨.

[10] ژمارەی حەدیسەکە(٤٠٢٤).

٣–بەرگەکە لەشی ئافرەتەکە بەرجەستە نەکات وەك سنگ و پێش و پاش.

٤–بەرگەکە ئەوەندە تەنك نەبێت کە لەژێرەوە پێستی دەربکەوێت، مونزیری کوڕی زوبەیر لەعێراقەوە قوماشێکی هێنا بۆ ئەسمای کچی ئەبوبەکر پاش ئەوەی چاوەکانی لەدەست دا، ئەسماش کەدەستیهێنا بەقوماشەکەدا وتی: ئۆف! ئەمە کەی قوماشە، بیدەنەوە پێی! مونزیریش ئەمە لەسەردڵی زۆر قورسبوو، وتی: دایەگیان خۆئەمە تەنك و شەفاف نیە، ئەسما وتی:( إنها إن لم تشف فإنها تصف)[11]، ئەگەر تەنك و شەفافیش نەبێت ئەوە ئەلکێت بەلەشداو قەبارەی لەشی دەرئەخات.

٥–بەرگێك نەبێت کە تایبەت بێت بەدینێکی تایبەتەوە یان بەکەسانێکی کافر یان بەرەلآ یان تایبەت بێت بەپیاوانەوە .

بەڵگەکانی ئەم مەرجانە هەندێکیان ئایەت یان حەدیسی لەسەر هاتووەو هەندێکیشیان لەڕۆحی شەریعەت و فەلسەفەو مەبەستەکانی شەریعەتەوە وەرگیراون..

[11] جلباب المرأة المسلمة في الكتاب والسنة، محمد ناصر الدين الألباني، رقم الحديث:١٢٦.

بۆ نمونە: خوای گەورە ئەفەرمویٚ (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ)، با(جیلبابەکانیان)بدەنەوە بەسەر خۆیانداو تاخوار لەشیان دابپۆشێت..هەروەها ئەفەرموێت: (وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ..)

یانی: بڵێ بەئافرەتانی ئیماندار باچاویان لەئاست نامەحرەمدا دابخەن و شەرمگەشیان بپارێزن و جوانیەکانیان دەرنەخەن ئەو شتانە نەبێت کە بەناچاری دەرئەکەون لێیانەوە، بائەوەش ئەرکیان بێت کە سەرپۆشەکانیان بهێننەوەو بیدەن بەسەر درزی کراسەکانیاندا.

(جیلباب) لەزمانی عەربیدا بەجلێك دەوترێت کە هەموو لەش دابپۆشێت کە لەئێستادا (عەبا)و (جبە)ئەگرێتەوە، وەك دکتۆر عبدالکریم زێدان لەکتێبی(المفصل في احکام المراة)داو (شێخ عەلی سایس ) لەکتێبی( تفسیر ایات احکام)دا بەدرێژی باسیانکردووە.

(جیلباب)و (خمار) دوو پۆشاکی ئافرەتانەن دانراون بۆ شاردنەوەی زینەتی ئافرەتان لەرووی نامەحرەمدا، هەندیٚ لەزانایان ئەڵێن: خیمار بۆ ماڵەوەیە (لەرووی

نامەحرەمەکانـــدا)، جیلبـــاب بـــۆ دەرەوەیـــە (لـــەرووی نامەحرەمدا).

هـەروەها ئەفـەرموێ:(وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا)، نـابێ زینـەت و جوانیـان دەربخـەن ئـەو شـوێنانە نـەبێت کـە خۆیـان دەرئەکـەون، کـە بـەپێی(شـەرع)و (عـەقڵ)و (واقیـع) بریتین لە(دەست)و (دەم و چاو) .. ئەی ئەمەی کە(شەرع) وا ئەفـــەرموێ ئەوەیـــە مانـــای گشـــتی ئایەتەکـــە بـــەروونی ئەیفـــەرموێ:(إِلَّا مَـا ظَهَـرَ مِنْهَـا)،[١٢] پێغەمبـــەریش(صـــلی اللەعلیەوالەوسلم)ئـەم مانایـە ڕۆشـنئەکاتەوە وەك لەسونەنی

---

[١٢] هەنـدێ لـەزانایان ئـەڵێن: (إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا)، یـانی: ئـەو خشـڵ و جوانیانـەی کـە پێیانەوەیەو دەرئەکەوێت وەك بازن و گوارەو خرخاڵ و.. هتد.، بەڵام ئەبوبـەکری جەصاص بەڕەحمەتبێت لە(احکام القران)داو لـە(٢/٣١٦)دا ئەفەرموێ: (ئـەوەی کـە ئـیبن مەسـعود ئـەڵێ:(مـا ظهـر منهـا) یـانی جلـەکانی، ئـەوە بەڕاسـتی هـیچ مانایـەکی نیـە، چونکە ئـەوە زانـراوە کاتێك کـەوترا جوانی، مەبەسـت پێـی ئـەو ئەندامەیـە کەجوانیەکـەی بەسـەرەوەیە، ئـەی مەگـەر ئـەو شـتانەی ئـافرەت خـۆی پێئەڕازێنێتەوە وەك ئاڵتون و خرخاڵ و ... دروستە بۆپیـاو سـەیریانبکات ئەگـەر ئافرەت نەیپۆشیبێ؟ لەمـەوە بۆمـان دەرئەکـەوێت کە مەبەسـت بە جوانی شـوێنی جوانیەکەیە نەك جوانکاریەکە، ئایەتەکەش هەروا ئەفەرموێ:( ولا يبدين زينتهن الا لبعولتهن ) کە مەبەسـت شـوێنی جوانیەکانـەو مانـاکردنی بـەجل و بـەرگ هـیچ مانای نییە.

**ئەبی داودا هاتووە لەعائیشەوە کە ئەڵێت:**( أن أسماء بنت أبي بكر رضي الله عنهما دخلت على رسول الله صلى الله عليه وسلم وعليها ثياب رقاق فأعرض عنها رسول الله صلى الله عليه وسلم وقال لها : يا أسماء إن المرأة إذا بلغت المحيضلم يصلح أن يرى منها إلا هذا وأشار إلى وجهه وكفيه)، **یانی:( ئەسمای کچی ئەبوبەکر(ڕەزای خوایان لێبێت)هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(صلى اللهعليهوالهوسلم) جلێکی ناسك(تەنك)ی لەبەردابوو، پێغەمبەر ڕووی لێوەرگێڕاو پێی فەرموو: ئەی ئەسما! گەر ئافرەت گەیشتە قۆناغی خوێنشتن باش نیە هیچ شوێنێکی ببینرێ ئەمەی نەبێت، ئاماژەیکرد بۆ دەموچاوو هەردوو دەستی خۆی.**

**(عەقڵ)یش هەروا حاڵی ئەبێ کە ئەوەی جیاکراوەتەوە بریتیەلەو شتە گشتیەی کە هەیە، ئەندامەکانی لەش هەموو عەورەتن و پێویستە داپۆشرێت و ئەوەی کە جیاکراوەتەوە بریتیە لەو ئەندامانەی کە داپۆشینیان قورس و گرانە کە بریتین لە(دەست و دەموچاو)، چونکە وەك(جەصصاص) فەرمووی: مانای نیە کە(ما ظهر منها) بریتیبێت لەجلوبەرگ، یان(خشڵ و کل و میکیاج)! چونکە خوا ئەفەرموێ:(ولايبدين زينتهن الا لبعولتهن)، جوانیەکانیان تەنیا بۆ مێردکانیان**

دەربخەن، دەی خۆ مەنیقی تێدانیە بووترێ: مێردو باوك و ئەوانەی باسکراون لەئایەتەکەدا دروستە بۆیان سەیری جلوبەرگی ئافرەتانی مەحرەم بەخۆیان بکەن!!

یان ئایا ئەوە مەنتیقی تێدایە کە(زينة) لەئایەتەکەدا جارێك بە(جل)و جارێك بە(عەورەت)و جارێك بە(خشڵ و جوانکاری) مانا بکرێت؟ لەکاتێکدا کەوشەکە بە(مەعریفەی ئیزافی) هاتووە (زينتهن)، لەبنەماکانی زمانی عەرەبیدا هاتووە: ئەگەر(نکرە) لەڕستەیەکدا دووبارەبوویەوە ئەوە هەر جارەی مانایەکی هەیە، بەڵام ئەگەر مەعریفە دووبارەکرایەوە ئەوە هەرهەمان مانای پێشووی هەیە، جگە لەم نمونەیەی سەرەوە، سەیری ئەم نمونەیەش بکە: خوای گەورە ئەفەرموێ:﴿ فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا (٥) إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا (٦)﴾ لەم ئایەتەدا دووجار وشەی(عسر)و دووجار وشەی(يسر)بەکاربراوە، (عوسرەکە) مەعرفەیەو (يسر)ەکە نەکیرەیە، بۆیە زانایان ئەڵێن:(ناڕەحەتیەکە) یەك شتە، بەڵام(ئاسانکاریەکە) دوو شتە، هەر بۆیە پێغەمبەر (صلی

اللەعلیەوالەوسلم) ئەفەرموێ:(لن یغلب العسر یسرین)،[١٣] یەك نارەحەتی ناتوانێ دوو ئاسانكاری ببەزێنێ..

(واقیع )یش هەر دەڵێ: ئەبێ ئەو(ماظهر منها) بریتیبێت لەدەست و دەم و چاو، چونكە بەڕاستی كاروباری دونیایی ئافرەتان وەك(كڕین)و (فرۆشتن)و (شایەتیدان)و (نوێژكردن)و (جیهادكردن)و ئەوكاروبارانە بەدەست و دەم و چاوی داپۆشراوەوە زۆر زەحمەتن، هەروەها ئایەتی﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾[١٤]، ئاماژەیە بۆ ئەمە، نەك ئەوە، بەڵكو بەئاشكرا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شتێك هەیە لەئافرەتانداو دەرئەكەوێت و پیاوان ئەركی سەرشانیانە چاوی لێدابخەن كە ئەویش بریتیە لە(دەست)و (دەم و چاو)، نەك عەورەتیان، نەك جلەكانیان وەك هەندێك وای بۆئەچن..

[١٣] . حەدیسەكە(لاوازة)بەڕای شێخ ناصرەدینی ئەلبانی، هەرچەندە (حاكم)و (مردویە)(مالك)و (بەیهەقی)یش ڕیوایەتیانكردووەو حەدیسەكە(مرسل)ەوقسەكە هی (حسن البصری)ە.

[١٤] بڵێ بە پیاوە ئیماندارەكان با چاویان لە ئاست ئافرەتی نامەحرەمدا دابخەن و شەرمگەشیان بپارێزن،ئەوە پاكترە بۆیان،بە دڵنیاییەوە خوا شارەزایە لەوەی دروستی ئەكەن.

## زیانەکانی بێحیجابی

لەدەستچوونی هەموو ئەو سودانەی لەبالآپۆشیدا هەیە خۆی بۆ خۆی زیانێکی گەورەیە ئەکەوێت لەئافرەتان..
ئەی مەگەر:

١-حیسابنەکردن بۆ قسەی خواو قسەی پێغەمبەری خوا (صلی اللهعلیەوالەوسلم)زیانی هەرە گەورە نیە؟

٢-خۆبێبەشکردن نیە لەو هەمووە بەرەکەتەی خوا ئەیرژێت بەسەر ئەو کەسانەدا کە گوێڕایەڵی ئەبن و ڕێز لەقسەو بڕیارەکانی ئەگرن ؟

٣-بەبێحیجابی ئەبیتە فیتنەو هۆ بۆ کاولکردنی ماڵی خەڵکی تر، بۆیە سبەی خەڵکی تریش ئەبنە فیتنەو هۆ بۆ کاولکردنی ماڵی تۆ، چونکە وەك ئەڵێن:(الجزاء من جنس العمل) پاداشت لەڕەگەزی کارەکە ئەبێت، یانی کەسێك بەفێڵ خەڵك بکوژێ، بەفێڵ ئەکوژرێتەوە، ناپاکی بکات لەگەڵ خەڵکی ناپاکی بەرامبەر ئەکرێت، ئارامی ماڵی خەڵکی تێکبدات ئارامی ماڵی تێکئەدرێت، ( شیعرەکەی شافعی بێنەوە بیرت  کە ئەفەرموێ:

عفوا تعف نساؤكم في المحرم .. وتجنبوا ما لا يليـــق بمسلم

إن الزنا دين فإن أقرضت    كان الوفاء من أهل بيــتك فعلم
من يَزْنِ يُزْنَ به ولو بجداره    إن كنت يا هذا لبيـ[illegible]ـا فافهم
يا هاتكا حرم الرجال وقاطعاً    سبل المودة عشت [illegible]
لو كنت حراً من سلالة آدم    ما كنت هتـــاكا لحرمة آدم

خۆتـان پـاكڕاگرن، ژنەكانیشـتان خۆیـان لەماڵـەوە پاكڕائـەگرن..دووربكەونــەوە لــەو شــتانەی شایســتەنین بەموسڵمان..زیناكردن قەرزە ئەگەر كردت، ئەبێ خێزانەكەت بـۆت بدەنـەوە ئـەو بـاش بزانـە، هەركـەس زینابكـات زینـای لەگەڵدا ئەكرێت ئەگەر لەگەڵ دیواری ماڵەكیشیدا بووە،ئەگەر خـاوەنی ئـاوەزی ئـەوە بـاش بزانە،ئـەی ئـەوەی ناموسـی خــەڵكی ئەشــكێنی و رێگەلەســەوزبوونی خۆشەویســتی ئەگری، دڵنیابە تاهەی ژیانێكی بێڕێزانە ئەبەیتەسەر، ئەگەر كەسێكی ئازادو نەجیب بویتایە ئەوە بەدڵنیاییەوە ئابڕووی هیچ مرۆڤێكت نەئەبرد.

٤-بێحیجـابی دەرگــای گوناهــەكانی تــریش لەمرۆڤــەكان ئەكاتــەوەو تائـەو دەرگایـەش بـەكراوەیی بمێنێتـەوە بـازاڕی گوناه لەلای ئەو كەسە هەر گەرمئەبێت و مرۆڤیش بەكۆڵێ

گوناهـەوە بچـێتەوە بـەردەم پـەروەردگاری دیـارە ڕووزەردی لای ئەو ئەبێت و خەجاڵەتیی بەسەردا دێت .

٥-بێحیجـابی ئـیرادەی مـرۆڤ لاواز ئـەکات و لەژیانـدا ئەبێتـە کەسێکی ئیرادە لاوازو نـاتوانێ ئازایانـە بڕیـار لەسـەر پرسـە چارەنوسسازەکانی خۆی بدات و لەرزۆک ئەبێت لەژیانیدا..

٦-بێحیجـابی بریتیـە لـە بەهـەدەردانی ڕێژەیـەکی بـاش لەجوانی و مێینەیی ئافرەت کە ئەوەش واقعێکە و زۆر کەس بەچاوی خۆی ئەیبینێ.

٧-ئـافرەتی بێحیجـاب پلـە بەپلـە ڕقـی لـەدین هەڵدەستێت و لێیدوورئەکەوێتەوە، چونکە ئەزانێ کە: دیـن چۆن حیجـابی فەرز کردووە، خەڵوەتیشی حەرامکردووە، چۆن سنووری بۆ ئەوانـە کێشـاوە، هـەرواش سـنووری بـۆ نـەزەرکردن و تێکەڵکردن داناوەو ئەتەکێتی تایبەتی بۆ پەیوەندی لەنێوان ئافرەت و پیاودا داناوەو مرۆڤی موسڵمان ئەبێ پەیڕەوی لەو ئەتەکێتانـە بکات.. بۆیـە بێحیجابی ئەبێتە هۆی ئـەوەی ئـەم سـنوورەو دوایـی ئـەو سـنوورەی تـر ئەبـەزێنێت و سنووربەزاندن لای ئاسـان ببێـت، ئـیبن قـەییمی جەوزیـە بەرەحمەتبێت، بـە درێـژی لـەکتێبی(روضـة المحـبين)دا باسـی

سوودەکانی پابەندبوون بەشەرعەوە ئەکات لەم بواری خەڵوەتنەگرتن و چاوداخستنەدا ،بۆنمونە ئەڵێت:

چاوداخستن سوودس زۆرە وەك:

یەکەم: بەدوور گرتن و پاککردنەوەی دڵ لەئازارو پەشیمانی و غەم وخەفەت.

دووەم: دڵ پڕئەبێت لەنوورو ڕووناکی و ئاسەوارەکەشی ئەکەوێتە سەر دەم و چاو و دەست و پێستی ئەو موسڵمانە، هەر لەبەر ئەمەشە – والله اعلم – بە دوای ئەوەدا کە ئەفەرمووێت: (قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ)، راستەوخۆ بەدوایدا ئەفەرموێت: (الله نور السماوات والارض) !!

سێیەم: دڵ پڕئەبێت لەهێزو ئازایەتی.

چوارەم: دڵ پڕئەبێت لەخۆشی و دڵگوشادی کە زۆر زۆرترە لەئەو تام و چێژو خۆشیەی کە خەڵکی تر لەنەزەرکردندا ئەیبینن، هۆکەشی ئەوەیە کە ئەوکەسە خۆی بەسەرکەوتوو

ئـەزانێت لەبەرامبـەر دوژمنەکەیـدا کـە نـەفس و شـەیتانەو هەستئەکات ئەم ئەوانی پێوەندکردووە نەك بەپێچەوانەوە[١٥].
پێنجەم: دلْ ڕزگاری ئەبێت لەئەسارەتی ئارەزووبازی.
شەشەم: دەرگایەکی گەورەی شەیتان دائەخات لەخۆی.
حەوتـــەم: ئـــەقلْ و ژیـــری مـــرۆڤ بەهێزئـــەکات و زیـــاتر دایئەمەزرێنێت...[١٦]

٨-بێحیجـابی بەتایبـەتی لەکۆمەڵگـە ئیسـلامیەکاندا زیـان بەسـومعەی ئـافرەت ئەگەیـەنێت و وایلێـدەکات تـەنیا ئـەو کەسانە چاوی تێبڕن بۆ زەواجکردن لەگەڵی کە گوێیان لـەوە نیـە ژن و کەسـوکاریان بێحیجاب بـن، ئەوەش بەتێپـەڕبوونی

---

[١٥] مەحوی شاعیر نەفسی خۆی لۆمەئەکات و ئەفەرموێ:
ئەسیرو صەیدو شەیدو قەیدی نەفسی ئەممارەم
لەدەست ئەم مارە بەدچارە چییە چارەم خوا چارەم
لەحەفتا تێڕیم زەرحەفتەیەك بۆ دین و دنیا
بەکەڵکی خۆم و کەڵکی کەس نەهاتم وەی چ بێکارەم
ئەدەوران و ئەخزمان و ئەشەیتا ن، بەمن ناکەن
ئەوی نەفسی خەسیسم مەحریا کردوویە دەربارەم
[١٦] بـە کورتی لـە لاپـەڕە (٩٥-١٠٢)ی کتێبـی (روضـة المحـبین)ی ئیبنـو قـەییمی جەوزیـە وەرگیراوە.

کات ئەبێتە زیانی گەورە لەئافرەت، ئەمەش واقعێکە ئێمە بیڵێین یان نا هەیە ..-بەداخەوە-.

٩-بێحیجابی جاری وا هەیە ئەبێتە هۆیەك کە ئافەرەتێك یان کوڕێـك بخاتـە داوی عەشـقێکی بـێ بناغـەوەو پـاش سەرفکردنی تەمـەنێك وەك سـەراب لەبەرچاوی نـەمێنێت و هەر داغ و فوغانی بۆ بمێنێتەوە. چونکە ناخی ئەکەوێتە زۆرانبازی لەگەڵ خۆیداو خۆی بەخۆی ئەڵێ:

*ئـەو ئافرەتـەی کەبێسـڵەمینەوە لـەدین یـان بـاوی ئیشپێکراوی کۆمەڵگە تۆ ئەکاتە هاوڕێ، ئایاسروشتی نیە کەیەکێکی ترو ئەوێکی تریش بکاتە هاوڕێی خۆی؟ تابەو کـارەی دەرفـەت و چانسـی زەواجـی بـۆ زیـاتر لەیـەکێك بکاتەوە؟ ئایا تۆ ئەزانی لەگەڵ تۆدا درۆئەکات یان لەگەڵ ئـەوانی تـردا درۆئـەکات و فریویانئـەدات؟! لەگـەڵ تـۆدا بەڕاستیەتی یان لەگەڵ یەکێکی تر لەواندا؟ ئایا هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەوانی تردا تا چ سنورێك بردووە؟ ئایا هاوڕێیەتی بێمتمانە داهاتووی چۆن ئەبێت؟ ئافرەتێك حیجاب فڕێبدات و دەرگـا بکاتـەوە بـۆ ئـەوەی پـێش زەواج مومارەسـەی خۆشەویسـتی بکات، ئایا کاتێك زەواجیکرد ئەتوانێ واز

لەخۆشەویستەکانی تری بهێنێت و ژێربەژێر لەو هاوڕێیەتیانەدا بەردەوام نەبێت؟ ئەی ئایا ئەگەر ئەمیش وازیهێنا ناگونجێ یەکێك لەئەوان هەر بەردەوامبێت و پەیوەندیە کۆنەکەی بکاتە کارتی فشار لەسەری و بۆنمونە پێبلێ: ئەگەر بەوشێوەیە نەکەیت کەئەیلێم ئەوە وێنەکانت..قسەکانت..نامەکانت.. ئەنێرم بۆ مێردەکەت!؟ زیاد لەمانەش: ئایا کوڕێك کە ئەزموونێکی هەیە لەڕاوکردنی کچدا پاش زەواجکردنی دڵنیائەبێت لەوەی کە ئەم خۆشەویستەی ئەو راوناکرێت لەلایەن گەنجێکی تری وەك خۆیەوە بازەواجیشی کردبێت؟ ئایا متمانەی پێویستی بەم ژنەی ئەبێت کەبیرئەکاتەوە ئەم بەکچێتی توانیویەتی بیخاتە داوی خۆیەوە؟

*لەمانە رزگاری نابێت جارێکی تر ئەکەوێتە ناو زۆرانبازی دەروونییەوەو بەخۆی ئەڵێ: ئایا تۆ رازیئەبیت و بریندارنابیت یەکێکی تر پەیوەندی نامەشروع لەگەڵ خوشکەکەت یان دایکت یان ژنەکەت...ببەستێت؟ یان خوانەکردە لاقەی یەکێکیان بکات؟ دەی تۆ چۆن بۆخۆت پێتناخۆشەو پێی بریندار ئەبیت، ئەبێ ئەوە بزانیت هەموو

کەسێکی تریش هەروایەو بریندارئەبێت بەوەی کەسێکی تر پەیوەندی نامەشروع بەژنی یان دایکی یان خوشکی ئەوەوە بکات!

١٠-یەکێکی تر لەزیانەکانی بێحیجابی ئەوەیە کەئافرەت ناچار ئەکات بۆ ئیسراف و زیادەڕۆیی لەهەموو شتێکدا:

*لەمیکیاجکردندا.

*لەجلو بەرگ و سێت ڕێکخستنیدا .

*لەدەست بەخۆداهێنانیدا .

*لەشوێن مۆدێل کەوتندا .

*لەپێشبڕکێ و ململانێکردن لەگەڵ کەسانی تردا..

ئەمانەش ئەبنە مایەی گیرفان ماندووکردن، دەروون شپرزکردن، دڵکرمنبوون، درەنگ ڕێکەوتن، نازونوککردن..

١١-بێحیجابی یەکێك لەزیانە گەورەکانی ئەوەیە ئافرەت فێری ناپاکی ئەکات، ناپاکی لەئەمانەتی جەستەی کەخوا پێیداوەو بۆیە پێیداوە تا جوانیەکەی تەنیا بۆ حەڵاڵی خۆی دەربخات، کەچی ئەو گوێ بەو فەرمانەی خوا نادات و تەواوی جەستەی یان هەندێکی بۆ نامەحرەم دەرئەخات! ئەوەش ناپاکیکردنە لەئەمانەت، خوا دڵی پێداوە

تاخۆشەویستی حەلاڵ و پاکیزەیی تێدا بچێنێت، کەچی ئەو خۆشەویستی گوناه و عەشقی مەجازی و خەڵك فریودانی تێدائەچێنێت، ئەمەش ناپاکیەکی ترە، خوا چاوو گوێ و دەمی بۆیە داوەتیٚ تالەخێرو حەلاڵدا بەکاریانبهێنیٚ، کەچی ئەو ناپاکیئەکات لەو ئەمانەتانەو لەحەرامدا بەکاریانئەهێنێت!! خوای گەورە ئەفەرمویٚ:﴿ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا﴾، واتە: بەدڵنیاییەوە (گویٚ) و (چاو) و (دڵ) هەر هەموو ئەمانە (کەدراون بەمرۆڤ) لێپرسینەوەیان لەسەرئەکرێت (لەقیامەتدا)، پێغەمبەریش(صلی اللەعلیەوالەوسلم) ئەفەرمویٚ «اسْتَحْيُوا مَنَ اللَّهِ حَقَّ الْحَيَاءِ »وەك پێویست شەرم لەخوا بکەن، وتیان: إنَّا لَنسْتَحيِي من اللَّه يا رسولَ اللَّه، والحمدُ للَّه » سوپاس بۆ خوا ئێمە هەموو شەرم لەخوا ئەکەین ئەی پێغەمبەری خوا!فەرمووی: قال : لَيس ذَلِكَ ، ولكنَّ الاسْتِحياءَ مِنَ اللَّهِ حَقَّ الْحَيَاءِ : أنْ تَحْفَظ الرَّأْسَ ومَا وَعى ، والْبَطْنَ ومَا حَوى ، وتذْكُرَ الموتَ والبلى ، وَمنْ أرادَ الآخِرَةَ تَرَك زِينَةَ الدُّنيا ، وآثَرَ الآخِرَةَ عَلى الأُولى ، فَمنْ فَعلَ ذِلكَ فَقَدِ اسْتَحْي من اللَّه حقَّ الحياءِ». ئەوە رادەی پێویست نیە! شەرمکردن لەخوا وەك پێویست ئەوەیە کە سەرت بپارێزی لەوەش کە

ئەیگرێتە خۆی، سکیشت بپارێزی لەوەش کە تێینەچێت، بیرت لای مردن و تیاچوونیش بێت، ئەوەی دوارۆژی بوێت واز لەدونیا دێنێت و باوی دوارۆژ ئەدات بەسەر دونیادا، جاهەرکەس وابکات ئەوە وەك پێویست شەرمی لەخوا کردووە[17].

جا ئەوەی لە سەردایە بریتییەلە(چاو، دەم (زمان)، گوێ، لووت، مێشك).

١. پاراستنی چاو بەوە ئەبێت بۆ شتێك نەڕوانی خوا حەرامیکردبێ.

٢. پارستنی دەم یان زمان بەوە ئەبێت کەشتێکی پێنەڵێی کەخوا حەرامیکردووە.

٣. پاراستنی گوێ بەوە ئەبێت کەشتێکی پێنەبیستی کەخوا حەرامیکردبێ.

٤. پاراستنی لووت بەوە ئەبێ بۆنی شتێکی پێنەکەی خوا ڕێگەت نەدات.

---

[17] رواه الترمذي

٥. پاراستنی مێشک بەوەی ئەبێ خەیاڵ نەدەی بەبیرکردنەوەی خراپ، یان بیرکردنەوە لەگوناه و شتانێک خوا بڕەنجێنی... نەک ئەمە بەڵکو ئەبێ:

٦. سەیری ئەو شتانەی بکەی کەخوا ڕازیە بۆیبڕوانی و پێیخۆشە، وەک سەیرکردنی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر(صلى اللەعلیەوالەوسلم)، سەیری سروشت و سەیری ئەو شتانەی خوات بیرئەخاتەوە.

٧. بەدەم یان بەزمان شتێک بڵێی کەخوا پێیخۆشەو پێرازییە.

٨. گوێچکەت بۆبیستنی شتی باش بەکاربهێنی وەک: گوێگرتن بۆ قورئان یان ئامۆژگاری ئیسلامی یان زانستی بەکەڵک یان ئەزموونی باشی خەڵک .... وە هەروەها.

٩. لووتت بۆ بۆنکردنی شتی حەڵاڵ بەکار بهێنی..

١٠. مێشکت بەکاربهێنی بۆ بیرکردنەوەی باش، خزمەتکردنی دین، جوانکردنی خێرو ناشیرنکردنی گوناه... ئەگەر واتکرد ئەوە شەرمت لەخوا کردووەو وەک پێویست، ئەگەر نا ئەوە دیارە پەردەی شەرمی نێوان تۆو خوای گەورە کونی تێبووەو پێویستە خێرا فریاییبکەوی، ئەوەش بزانە

جیاوازی نێوان تۆو ئەو کەسەی کە بێشەرمە لەحزوری خوادا تەنیا ئەوەندەیە، ئەو ئارامناگرێت تابەحەلاڵی ئەگاتە ئەوەی خوای گەورە بۆی داناوەو کردوویە بەنسیبی، بەلام تۆ ئارامگرتنەکەت و متمانەبوونەکەت بەخواو یاسای خوا بوەتە قەلایەك لەبەردەم تیرەکانی شەیتاندا، ئەو پاش ئەو چێژە کەمە لەو گوناهە ئەیبینێ چێژ ئەڕواو خەجاڵەتی و پەشیمانی سەری تێئەکات، بەلام تۆ پاش ئەوەی بەحەلاڵی ئەگەیتە ئەوەی ئەو بەحەرامی پێیگەیشتوە بەردەوام چێژئەبەی بەئارامی، نەك خەجاڵەتیش نیت بەڵکو دڵخۆش و بەختەوەریت و شانازیش ئەکەی ..

١١-یەکێکی تر لەزیانەکانی بێحیجابی و فڕێدانی حیجاب و لەچك بەر لەهەموو شتێك زیانگەیاندنە بەئیمان و قیامەتی مرۆڤ، زوویرکردن و ڕەنجاندنی خوایە لەخۆت، گەروکردنی باری گوناهە زیاترو زیاتر، بۆنمونە: تۆ کەبەبێ حیجاب لەماڵ دەرئەچی هەموو نەزەرێك کە لەسەری رووتت یان قاچی رووتت یان گەردن و باسکی رووتت ئەکرێ ئەگەر بۆنمونە سەد کەس بۆت بڕوانن بەناشەرعی ئەوە هەریەکەیان گوناهێکیان بۆ ئەنووسرێت، بەلام صەد گوناه

بۆ تۆ ئەونووسرێت! خۆئەگەر باوك و دایكی هەژاریشت هانیانـدابیت یـان ئامۆژگـاری خێریـان نـەكردبیت ئـەوە ئەوانیش وەك تۆ باری گوناهیان قورس ئەبێت، دەی ئەم زیانە كەمە لەخۆت و لەباوك و دایكی هەژارتی ئەدەیت؟!

## بەشی دووەم
## وەلامی هەندێ گومان لەسەر بالاپۆشی

**بڕگەی یەکەم: گومان لەسەر تەفسیری ئایەتەکانی حیجاب لەقورئاندا**

هەندێ کەس کە بەئاشکراو ڕاشکاوانە ناتوانێت یان نایزانێت یان ناوێرێت هێرش بکاتەسەر حیجاب و ڕیش و گەردنگیری بەئیسلامەوە، دێت پەنا بۆ شێوازی چەمۆڵە گرتن ئەبات بەلاّم لەگیرفانەوە! .. بۆ نمونە دێت ئەو کتێب و وتارانە وەرئەگێڕێتە سەر زمانی کوردی کە قسە بەحیجاب و بالاپۆشی ئەڵێن، یان گومان لەسەر ئەو فەریزەیە دروستئەکەن، بۆنمونە ئەڵێن:

ئایەتەکانی حیجاب ڕوون نین لەئیسلامدا !! لەقورئاندا باسی حیجاب هەر نەکراوە، حیجاب خویەکی کۆمەڵگەی عەرەبی بووەو قۆناغ قۆناغ گوازراوەتەوە بۆ کۆمەڵگەی کوردەواری[18]

---

[18]. لەناو کوردا شاعیرانی وەك بێکەس و شێرکۆی کوڕی و نوسەرانی وەك ( عەبدولخالق مەعرووف) لەو کەسانەن کە ئەم بیرۆکەو گومانانە ئەخەنە ناو کۆمەڵگەی کوردەواریەوە.

ئێمەش لە وەلاًمی ئەو گومانەدا ئەڵێین :

١-پێش ئیسلام ئافرەتان لەسەردەمی نەفامیدا بەسەری ڕووت و گەردنی بەرەلاًو قاچ و قولی دانەپۆشراوەوە گەڕاون، بەلاًم کەئیسلام هات ئەو کارە ترسناکانەی لەسەر تاك و کۆمەڵگە حەرامکردو فەرمووی: وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى)، واتە: وەك نەفامی سەرەتا خۆتان مەڕازێننەوە .. زانایان ئەفەرموون:( لەنەفامی سەرەتادا ئافرەتان بەگەردنی ڕووت و باسك و مەچەکی دانەپۆشراوەوە لەناو خەڵکیدا ئەهاتن و ئەڕۆیشتن، خوای گەورەش ئەوەی لێحەرامکردن و فەرمووی:(وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى)[١٩].

خوای گەورە بەڕوونی و بێ ئەملاولاکردن ئەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا) ئەم ئایەتەش بەئاشکرا حیجاب ئەکاتە ئەرکی سەر شانی ( ژنانی پێغەمبەر و کچانی پێغەمبەر و ژنانی گشت ئیمانداران).

---

[١٩]. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە تەفسیری ئایەتی (٣٣) لەسورەتی (ئەلئەحزاب) لەکتێبی( تفسير ابن كثير )دا.

بۆیــــەش (ژنــــان و کچـــانی) پێغەمبــــەری(صـــــلی اللەعلیەوالەوسـلم)پێشخســتووە چـونکە لەئیس لامدا هـیچ کەسێك لەسەروو یاساوە نییە، یاسا ئەبێت بەسەر هەمە اندا وەك یەك جێبەجێبکرێت، هۆیەکی تر بۆ پێشخستنی ژنان و کچانی پێغەمبەر(صلی اللەعلیەوالەوسلم)ئەوەیە تا هەموو ئافرەتانی تـر چاویانلێبکەن و وەك ئەوان دینداری بکەن، هۆیەکی تریش ئەوەیە بێگومان ئەوان دەرەوەو ناوەوەی ئەم ئایینـەیان بەدروسـتی و دوور لەهـەواو ئارەزووپەرسـتی لەپێغەمبەر وەرئەگرن و بوار بۆ(تەئویل)و (لادان) ناهێڵنەوە

خـاڵێکی تـریش لەهۆیـەکانی پێشخسـتنی ژنـانی پێغەمبــەرو کچـانی پێغەمبــەر(صــلی اللەعلیەوالەوســلم) لەدابەزانـدنی ئـەم ئەرکـەدا بۆیـان ئەوەیـە: ئامـاژە بکـات بـۆ هـەڵگرانی ئیسـلام و کـادیرانی ڕێگـەی ئـەم دینـە: کاتێـك سەرکەوتوو ئـەبن کـەخۆیان و مـاڵ و منداڵیـان پـێش هـەموو کەســـێك پابەنـــدبن بەڕێنماییـــەکانی دینەکەیانـــەوە، تاخەڵکیش چاویانلێبکەن و ئەو خووەی ناو یەهودیان تێدا بنەبڕ ببێت کە شتی باشیان بەخەڵك ئەوت کەچی خۆیان

نەیانئەکرد، وەك خوای گەورە لەقورئاندا زەمییانئەکات و ئەفەرموێت ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ وَأَنْتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾، ئەوە چۆن فەرمان بەخەڵکی ئەکەن بۆ کردنی چاکەو کەچی خۆتانتان لەبیرئەچێت؟! لەکاتێکدا ئێوە کتێب ئەخوێننەوە، ئەوە بۆچی عەقڵ ناگرن؟ بۆ زیاتر روونکردنەوەی وەڵامی ئەم گومانە پێویستە بڵێین:

پێناسەی حیجاب یان بالآپۆش-وەك وتمان- بریتیە لە: هەر پاچە قوماشێك کەئافرەت هەموو لەشی پێداپپۆشێت دەست و دەموچاوی نەبێت، ئیتر دووراو بێت یان دەرەدامان بێت، دوراو وەك جبە، دەرەدامانیش وەك عەبا.

حوکمی بالآپۆشی: بالآپۆشی لەئیسلامدا فەرزکراوە لەسەر هەموو ئافرەتێکی ژیری باڵغی ئازادی گەنج کە گەیشتبێتە قۆناغی خوێنشتن، لەمەشەوە دەرئەکەوێت کەپیاو یان ئافرەتی شێت یان نابالغ یان کۆیلە یان پیرەژن یان ئافرەتێك نەگەیشتبێتە قۆناغی خوێنشتن، هەموو ئەمانە فەرزنیە لەسەریان بالآیان بپۆشن..

بەڵگەکانی بالآپۆشین: بەڵگەکانی بالآپۆشین لەقورئان و حەدیس و ئیجماعی زانایانەوە وەرگیراوەو ژمارەیەکی زۆر

ئایەت و حەدیس هەیەو ئێمە لەم نامیلکە بچوکەدا تەنیا یەك دوو بەڵگەی زۆر روون دەهێنینەوە:

**بەڵگە قورئانیەکان:**

زانایان بەشێوەیەکی گشتی سێ ئایەت ئەکەنە بەڵگە بۆ ئەم فەرزبوونی بالآپۆشی:

(ئایـەتی خیمـار)و (ئایـەتی جیلبـاب)و (ئایـەتی قەواعیـد):

ئایـەتی قەواعیـد ئەفـەرموێ:(وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَنْ يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ وَأَنْ يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَهُنَّ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ)،یـانی:ئـەو ئافرەتـە پیرانـەی کەئومێـدیان بەشـووکردن نـەماوە گوناهیانناگـات ئەگـەر بەرگـەکانیان(حیجابـەکانیان) لاببـەن بـێ ئـەوەی خۆیـان بەجوانیـەوە دەربخـەن، خۆئەگـەر خۆیـان پاکـڕابگرن ئـەوە خێرترە بۆیان و خواش بیسەرو زانایە.

کەواتە جگە لەو توێژەی ناو ئافرەتـان ئەگـەر هـەر ئافـەرتێکی تر حیجابەکەی لاببات ئەوە گوناهبار ئەبێت و خـۆی تووشـی سزای خوایی ئەکات، ئەمە زۆر ڕوونە.

ئایـەتی جیلبـابیش ئەفـەرموێ:(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا

یُؤْذَیْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِیمًا)، ئەی پێغەمبەر! بەژنەكانت و بەكچەكانت و بەئافرەتی ئیماندارانیش بڵێ:باعەبا(چارشێو)ەكانیان نزیكبكەنەوە(لەزەوی)و خۆیانی پێداببۆشن، ئەوە كەمترین بارە تابناسرێنەوەو ئازاریان پێنەگات، خواش لێبووردەو بەسۆزە.

كەواتە ئەبێ ئافرەتانی موسڵمان بەداپۆشینی جەستەیان بەعەباو چارشێو خۆیان جیابكەنەوە لەئافرەتانی تر بۆ ئەوەی ئازاریان پێنەگات و كەسانی خراپ و نەفسنزم تەمایان تێنەكەن، ئەو ئافرەتەش وانەكات ئەوە فەرمانی خوای شكاندووەو سوكایەتی بەقسەی ئەو پەروەردگارە كردووە.

ئایەتی خیماریش ئەفەرموێ: (وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ یَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَیَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا یُبْدِینَ زِینَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْیَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُیُوبِهِنَّ..)

یانی: بڵێ بەئافرەتانی ئیماندار باچاویان لەئاست نامەحرەمدا دابخەن و شەرمگەشیان بپارێزن و جوانیەكانیان دەرنەخەن ئەو شتانە نەبێت كە بەناچاری دەرئەكەون

لێیانــەوە، بائــەوەش ئــەرکیان بێــت کــە سەرپۆشــەکانیان بهێننەوەو بیدەن بەسەر درزی کراسەکانیاندا.

بـەپێی ئـەم ئایەتـەش ئافرەتـانی موسـڵمان ئـەبێ سەرپۆشیان هـەبێت و ئـەو سـەرپۆشـەش ئەوەنـدە گـەورەبێت سنگ و گەردنیان بشارێتەوەو دەرنەکەون.

هـۆی دابـەزینی ئـەم ئایەتـەش وەك موقـاتیلی کـوڕی حەییان باسیکردوە، ئەڵێت: پێمانگەیشتوە . خوا زاناترە . کــە جــابری کــوڕی عەبــدوڵلآی ئەنســاری گێڕاویەتیــەوە، ئەسمای کچی مورشیدە لەشوێنێکی تایبەت بەخۆی بوو– لەبـەنی حاریسـە– ژنـان ئەچـوون بـۆ شـوێنەکەی و پەلکـەو گـوارەو سـنگ و مـل و پاوانـەکانیان بـەدەرەوە بـوو، ئـەسما بەمە بێزار بوو، ووتی: ئەمە چەند ناشیرینە، خوای گـەورەش ئــەو ئایەتــەی دابەزانــد: (وَقُـلْ لِلْمُؤْمِنَـاتِ يَغْضُضْـنَ مِـنْ أَبْصَـارِهِنَّ وَيَحْفَظْـنَ فُـرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْـدِينَ زِينَتَهُـنَّ إِلَّا مَـا ظَهَـرَ مِنْهَـا وَلْيَضْـرِبْنَ بِخُمُـرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَـائِهِنَّ أَوْ أَبْنَـاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْـوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْـوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَـوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَـائِهِنَّ أَوْ مَـا مَلَكَـتْ أَيْمَـانُهُنَّ أَوِ التَّـابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِـنَ الرِّجَـالِ أَوِ

الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٣١)

**ئەم سێ ئایەتە بەڕوونی دەریدەخەن کە بالاپۆشی ئەرکێکی ئیسلامیەو پەیوەند نیە بە عەرەبەکانەوە، یان تایبەت بێت بەژنانی پێغەمبەرەوە(صلی اللەعلیەوالەوسلم) وەك هەندێ کەس ئەیخەنەناو کۆمەڵگەی کوردەواریەوە.**

**بۆ باس ئەشێت کەماوەیەك زۆر گەڕام بۆ ئەوەی بگەمە ئەو راستیەی: ئایا ئایەتەکانی سوورەتی نوور کە باسی سەرپۆش ئەکەن پێش ئایەتەکانی سوورەتی ئەلئەحزاب هاتوونەتەخوارەوە کە باسی(جیلباب )(عەبا یان جبە)ئەکەن، یان بەپێچەوانەوە ئەمانەی ئەحزاب پێش ئەوانەی نوور دابەزیوون، پاش گەڕان بەناو سەرچاوە ئیسلامیەکاندا بۆمدەرکەوت کە: ئایەتەکانی ئەلئەحزاب پاش ئەوانەی سوورەتی نوور هاتووەنەتە خوارەوە، وەك ئیبن سەعد لە(الطبقات الكبرى:٢/٦٣-٦٥)دا باسیئەکات و زۆرێك لەزانا ناودارو متمانەدارەکانی ئوممەتی ئیسلامیش ئەوە پشتڕاستئەکەنەوە، ئیبن سەعد ئەڵێ:(أن غزوة بني المصطلق وقعت في شعبان في سنة خمس، و وقعت بعدها غزوة**

الأحزاب(غزوة الخندق) في ذي القعدة من السنة نفسها !) گەورەترین شایەتیش کە ئەم ڕایەی ئیبن سەعد پشتڕاستئەکاتەوە ئەوەیە دایکمان عائیشە کە باسی بوختانەکە ئەکات کە بۆیان هەڵبەست، لەهەندێ شوێندا باسی ئەو موناقەشەیەش ئەکات کە لەسەر ئەو کەوتە نێوان سەعدی کوڕی موعازو سەعدی کوڕی عوبادە، کەئەمەش دەریئەخات تادابەزینی سوورەتی نوور سەعدی کوڕی موعاز هەر لەژیاندا بووە، مێژوونووسانیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە سەعدی کوڕی موعاز دوای شەڕی ئەحزاب و دروست دوای شەڕی بەنوقورەیزە وەفاتی کرد، کەواتە شەڕی بەنی موستەلەق پێش شەڕی خەندەق بووە کە ئەویان هۆی دابەزینی سوورەتی نوورو ئەمیان هۆی دابەزینی سوورەتی ئەحزاب بوو.[20]

---

[20] ئەو زانایانەی تەرجیحی ئەوە ئەدەن شەڕی بەنی موستەلەق پێش ئەحزاب بووەو بەو شێوەیەش ئایەتەکانی سوورەتی نوور پێش ئایەتەکانی سوورەتی ئەحزاب دابەزیون، ژمارەیەکی زۆرن، ئەم زانا بەڕێزانە ڕایەکەی خۆشیان بەزۆر بەڵگە بەهێزکردووەو موناقەشەی ڕای بەرانبەریشیان کردووە، بۆنمونە: ئیبنولقەییم لە:(زاد المعاد)دا، شێخ صالح ئەلمغامسی لەکتێبی(الأيام النظرة والسيرة العطرة لرسولنا صلى الله عليه وسلم)، موبارەکفوری لەکتێبی(الرحيق المختوم)دا، عەلی ئەلحەلەبی لەکتێبی(إنسان العيون في

ئەگەر ئەمە وابێت کەواتە: قۆناغی یەکەمی حیجاب بریتیبووە لەیاساکانی سوورەتی نوور کە سەرپۆشکردن و خۆدەرنەخستن بووە بۆ ئەوانە نەبێت کە ئایەتەکە دیاریکردوون و هەر بەو جلوبەرگانەشەوە هاتوچۆی دەرەوەشیان کردووە، بەلام ئایەتەکانی سوورەتی ئەحزاب (عەبا)یان(جبە)یان فەرزکردووە بۆ چوونە دەرەوە بۆ نوێژەکان و چەژنەکان و پێویستیەکان.

بەلگەکان لەفەرموودەکاندا، تەنیا دوو بەلگەی ئاشکرا باسئەکەین:

یەکەم : فەرموودەکەی عائیشەو ئەسما:

---

سیرة الأمین المأمون) کەبەسیرەی حەلەبی ناسراوە، ئیبن کەسیر لە(السیرة النبویة)کەیدا، موسای کوڕی عوقبەو ئیبن سەعدو ئیبن قوتەیبەو ئەلبەلازەری و ئیمامی زەهەبی و ئیبن حەجەری ئەلعەسقەلانی و شێخ خزری بەگ و شێخ موحەممەدی ئەلغەزالی و شێخ بووتی و عەلی ئەلصەللابی و مەحمود شیت خەتتاب و کەتانی لەکتێبی(المختصر الکبیر فی سیرة الرسول الامین)داو شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لەکتێبی(بدایة سیرة الرسول)و موحەممەدی کوڕی عومەری بەحرەقی شافیعی لەکتێبی(حدائق الأنوار ومطالع الأسرار فی سیرة النبی المختار)دا...هتد هەموو ئەمانە لەسەر ئەو ڕایەن کە شەڕی بەنی موستەلەق لەساڵی پێنجەمی کۆچیدا بووەو پێش شەڕی ئەحزاب کەوتووە، بەو شێوەیەش ئایەتەکانی سوورەتی ئەلئەحزاب و حوکمەکانی دوای ئایەتەکانی سوورەتی نوورو ئەحکامەکانی ئەو سوورەتە دابەزیوون..خواش زاناترو ئاگادارترە.

**لەسونەنی ئەبی داودا هاتووەو لەعائیشەوە کە ئەڵێت:(** أن أسماء بنت أبي بكر رضي الله عنهما دخلت على رسول الله صلى الله عليه وسلم وعليها ثياب رقاق فأعرض عنها رسول الله صلى الله عليه وسلم وقال لها : يا أسماء إن المرأة إذا بلغت المحيضلم يصلح أن يرى منها إلا هذا وأشار إلى وجهه وكفيه)، **یانی:( ئەسمای کچی ئەبوبەکر(ڕەزای خوایان لێبێت)هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(صلی اللەعلیەوالەوسلم) جلێکی ناسك(تەنك)ی لەبەردابوو، پێغەمبەر رووی لێوەرگێڕاو پێی فەرموو: ئەی ئەسما! گەر ئافرەت گەیشتە قۆناغی خوێنشتن باش نیە هیچ شوێنێکی ببینرێ ئەمەی نەبێت، ئامارژەیکرد بۆ دەموچاوو هەردوو دەستی خۆی.**

**لەم فەرموودەیەوە دەرئەکەوێت کە:**

**١-ئافرەتی موسڵمان حەلاڵ نیە بۆی کەگەیشتە قۆناغی خوێنشتن جگە لەدەست و دەموچاوی هیچ شوێنێکی تری پیشانی نامەحرەم بدات، نامەحرەمیش هەموو پیاوێکە کە دروست بێت بۆ ئەو ئافرەتە شووی پێبکات.**

**٢-ئافرەتانی موسڵمان بۆیان حەلاڵ نیە کەجلوبەرگێك لەبەربکەن تەنکبێت و جگە لەدەموچاو دەستیان دەربخات و**

پێستەکەیان لەژێرەوە دەربکەوێت، وەك پێغەمبەر(صلی اللەعلیەوالەوسلم) رووی لەئەسمای ژن خوشکی خۆی وەرگێڕا کەبینی جلوبەرگەکانی تەنکن و فەرمووی:(ئەی ئەسما! گەر ئافرەت گەیشتە قۆناغی خوێنشتن باش نیە هیچ شوێنێکی ببینرێ ئەمەی نەبێت).

٣-سنووری خوارەوەی بالاپۆشی لەناو ماڵداو لەسەردەمی پێغەمبەرو صەحابەکاندا بریتیبووەلە جلوبەرگێکی گشتی داپۆشەر لەکاتی بوونی نامەحرەمدا، بۆ دەرەوەش بەرگێکی تایبەتی بووە کەئافرەتە موسڵمانەکانی پێجیاکراوەتەوە لەئافرەتانی تر کە بەجیلباب یان عەبا یان(جبە)ناسراوبووە. وەك لەمانای ئایەتەکانەوە رۆشنبوویەوە.

ئەوەتا کە باسی جلوبەرگ ئەکرێت لای پێغەمبەر(صلی اللەعلیەوالەوسلم) چۆن بێت و چۆنی بپۆشن شەرعیەو خوا پێیرازیە، ئەو سنوورەکانی خوارەوە دیاریئەکات، وەك لەحەدیسی ئیبن عومەردا هاتووە پێغەمبەر(صلی اللەعلیەوالەوسلم)فەرمووی:« مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلَاءَ لَمْ يَنْظُرْ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ »، هەرکەس جلەکانی بەدوای خۆیدا رابکێشێت-لەبەر لووتبەرزی- ئەوە خوا بەچاوی

سۆزەوە بۆی ناڕوانێت لەرۆژی قیامەتدا، ئوم سەلەمە ووتی: ئەی ئافرەتان بۆ دامانەکانیان چی بکەن؟ فەرمووی: بائەوان بستێك دامانەکانیان بۆ خوارەوە شۆڕبکەنەوە، ئوم سەلەمە ووتی: کەواتە قاچیان بەدەرەوە ئەبێت؟ پێغەمبەر(صلی اللهعلیەوالەوسلم)فەرمووی:«فَيُرْخِينَهُ ذِرَاعًا لَا يَزِدْنَ عَلَيْهِ»، کەواتە بابالێك کراسەکانیان شۆڕبکەنەوەو لەو زیاتر نەبێت.[21]

بەم فەرموودەیەدا دەرئەکەوێت کە جلوبەرگی ئافرەتان لەباری ئاساییدا بریتیبووە لەرووسەریەك و کراسێکی دەرەدامان کە بەسەرپۆشەکە سەروسنگ و بەرۆکیان داپۆشیوەو بەکراسەکەش قاچو قوولیان داپۆشیوە لەرووی نامەحرەمدا.

دووەم: فەرموودەکەی ئوم عەتییە:

ئوم عەتییە ئەڵێ: أمرنا أن نخرج الحُيّض يوم العيدين وذوات الخدور فيشهدن جماعة المسلمين ودعوتهم ويعتزل الحيض عن مصلاهن .قال امرأة: يارسول الله إحدانا ليس لها جلباب، قال: لتلبسها صاحبتها من جلبابها. رواه البخاري ومسلم.

[21] رَوَاهُ النَّسَائِيّ وَالتِّرْمِذِيُّ وَصَحَّحَهُ.

یانی ئێمە فەرمانمان پێکرابوو بۆ کۆبوونەوەی جەژنەکان هەموو ئەو ئافرەتانە بەرینەدەرەوە کە گەیشتبوونە قۆناغی خوێنشتن و هەموو ئەوانەش کەپەردەیان بۆ جیاکرابوویەوە، بۆ ئەوەی کۆمەڵبوونەوەی موسڵمانان ببینن و بەشدابن لەنزاکانداو ئەوانەی لەبێنوێژدان دائەبڕان لەشوێنی نوێژەکە، ئافرەتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئافرەتی وا هەیە(عەبا) یان(جبە)ی نیە؟ فەرمووی: با هاورێکەی بیپێچێت بە عەباکەی خۆیەوە[22].

ئەم فەرموودەیە دەرئەبڕێت کە:

١-جیلباب بۆ دەرەوەیەو خیمار بۆ ماڵەوەیە، کشمیری لەکتێبی"فيض الباري"دا لەراڤەی ئەم فەرموودەی ئوم عەتییەدا ئەڵێ:( وعلم منه أن الجلباب مطلوب عند الخروج ).

---

[22] مەندیێ (لتلبسها صاحبتها من جلبابها..) بەوە مانائەکات: باجلبابێکی زیادی خۆی -کەلەماڵەوە هەیەتی- بەئەمانەت بدات بەهاورێکەی و بیپۆشێت بۆ دەرەوە، بەڵام لەراستیدا ئەو مانایە دوورە، چونکە حەدیسەکە ئەفەرموێ: (لتلبسها)، یانی: با هاورێکەی بیپێچێت بەجلبابەکەی خۆیەوە، (جلبابها): مەعریفەیەو ("جلابيبها" نیە) تا زیهن بۆ جبەو عەباکانی ماڵەوە بڕوات، مانای(لباس)بەگشتی و کرداری(يلبس و تلبس)یش یانی پێچانەوەی شتێك بەشتێکی تر، خوای گەورە بەجوولەکە ئەفەرموێ: (ولاتلبسوا الحق بالباطل)یانی هەق مەپێچن بەناهەقەوە..

لەفەرموودەکەوە ئەوە ئەزانرێت کە عەبا یان جبە یان حیجاب لەبەرکردن بۆچوونەدەرەوە شتێکی داواکراوە.

٢-زانایان ئەڵێن: لەقسەی ئەو ئافرەتەوە کەئەپرسێت:(إحدانا ليس لها جلباب؟) دەرئەکەوێت کە عەبا یان جیلباب پۆشاکی سەرەکی ئافرەتان نەبووە، یانی پۆشاکی بنەڕەتی نەبووە بۆ داپۆشینی شوێنە دەرنەکەوتووەکانی ئافرەتان، بۆیە پێویست بووە کە(عەبا)یان(جبە) بەکاربهێنرێت لەکاتی چوونەدەرەوەدا، بەتایبەتی دەرچوون لەشەودا بۆ پێویستیەکان و دەرچوون لەرۆژدا بۆ نوێژە جەماعەتەکان.

٣-لەفەرموودەکەوە دەرئەکەوێت کە(عەبا) یان (جبە) بۆ چوونەدەرەوە بەکاربراوەو ئافرەت لەماڵدا جلوبەرگی ئاسایی خۆی هەبووە کە هەم نوێژەکانیشی پێوەکردووەو هەم هەڵسوکەوتی پێوەکردووە لەگەڵ میوان و پیاوانی نامەحرەمدا.

٤-لەفەرموودەیەکی دایکمان عائیشەوە دەرئەکەوێت کە ئەو جلوبەرگە ئاساییانەی ئافرەتان هەیانبووە، پێکهاتووە لە"دِرع" و"خِمار"واتە: کراس و سەرپۆش، کە کراسەکە مەرجی

ئەوەبووە کەئەوەندە درێـژبێت قاچـەکانی داپۆشـێت، وەك موحەمـــەدی کـــوڕی زەیـــدی کـــوڕی قونفـــوز کەئـــەویش لەدایکیـەوە ئەگێڕێتـەوە کـە لـەدایکمان عائیشـەی پرسـیوە: ئافرەت نوێژەکانی بەچ جۆرە جلوبەرگێکەوە بکات؟ ئەویش فەرموویـــەتی: "تصـلي في الخمـار والـدرع السـابغ إذا غيَّـب ظهـور قدميها". نوێـژەکانی بەسەرپۆشـێك و کراسـێکەوە بکـات کـە سەری قاچەکانی داپۆشێت.

٥-پوختـەی قسـە ئەوەیـە کـەدیرع و خیمـار بـەس بـوون بـۆ نوێـژکردن، ئـەوەش مانـای ئەوەیـە ئـەو دوو پارچـە قوماشـە عـەورەتیان بەتـەواوی داپۆشـیوە، یـانی بـەو دوو پارچـەیە ئەرکە شەرعیەکەیان بەجێهێناوە کە ئایەتی(ولا يبدين زينتهن إلا ماظهر منها) خسـتوویەتیە سەرشـانیان، کـە ئەمـەش وابێـت کەواتـە جیلبـاب(عـەبا) یـان (جبـە) شـتێکی زیـاتر بـووە لـەو قوماشـــەی کـــە ئەرکـــە شـــەرعیەکەی پـــێ ئەنجامـــدراوە کـــە شـــاردنەوەی عەورەتـــە لەبێگانـــە لەناوماڵـــدا بووبێـــت یـــان لەدەرەوماڵ کردندا بووبێت.

٦- ئەکرێ بووترێت: (عـەبا)یـان(جبـە)پلەیـەکی سـەرووترە لەخۆداپۆشینی گشتی، ئەویان ئەسڵی پۆشاکی ئیسلامیەو

ئـــەمیان کـــەماڵی پۆشـــاکی ئیســـلامیە کـــە فەلســـەفەی جیابوونەوەکە لەعـەباو (جبـە)کـەدا زیـاتر بەرجەسـتە ئەبێت نـــەك ســـــەرپۆش و تـــــەنوورە یـــــان کـــــراس، یـــــانی لە(خمار)و(درع)ەکەدا.، خۆئەگەر زیـاتر تەئەموول لـە ئایـەتی جلبابدا بکەی بۆت دەرئەکەوێ کە(ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ) بۆدەرەوەیە نـەك بۆ ماڵـەوە، لـەدەرەوەدا ئـازار رووڵـەئافرەتان ئەکات نەك لەماڵەوە، لەدەرەوە پێویست بەو خۆناسینە هەیـە نەك لەماڵـەوە، بـە جیلبـاب ئـەو ئامانجـە جێبەجێئـەبێت نـەك تەنیا بەدرع و خیمار..

٧- لەفـــــەرموودەکانی پێغەمبـــــەرو هەڵســـــوکەوتی صـەحابەبەڕێزەکانەوە دەرکـەوتووە کـە ئـافرەت بـۆ زیـادە فـەزلێکی خـۆی بـۆ کـاتی نوێـژکردن بەسـەر کراسەکەشـیدا تەنوورەیـەکی لەبـەرکردووەو هەشـبووە ئـەوەی نـەکردووە، وەك عوبەیـدولای خـەولانی کـەمناڵێکی بێبـاوك بـوو لای مەیمونـەی خێزانـی پێغەمبـەر(صـلی اللهعلیەوالەوسـلم) ئـەڵێ:(رَأَيتُ مَيْمُونَةَ تُصَلِّي فِي دِرْعٍ سَابِغٍ وَخِمَارٍ لَيْسَ عَلَيْهَا إِزَارٌ)، مەیمونـەم بـینی نوێـژی ئـەکرد بەکراسـێکی دەرەدامـان و سەرپۆشـێکەوە تـەنوورەی لەبەرنـەکردبوو، دیـارە ئەگـەر

**کراسەکە قاچ داپۆشێت پێویست بەو ئیحتیاتە زیادەیە ناکات بۆ نوێژکردن "ئیزار" لەبەربکرێت.**[٢٣]

**ئوم سەلەمە ئەفەرموێ: پرسیارمکرد لەپێغەمبەر(صلی اللەعلیەوالەوسلم):** أَتُصَلِّي اَلْمَرْأَةُ فِي دِرْعٍ وَخِمَارٍ ، بِغَيْرِ إِزَارٍ؟ قَالَ:"إِذَا كَانَ اَلدِّرْعُ سَابِغًا يُغَطِّي ظُهُورَ قَدَمَيْهَا"[٢٤]

**کەواتە: بەڵگەی فەرزبوونی حیجاب یان بالآپۆشی لەچەندین ئایەت و حەدیسەوە وەرگیراون کە ئێمە تەنیا ئەو چەند بەڵگە کورتەمان هێناو بەکورتیش راڤەمان بۆکردن و ئەم نامیلکەیەش جێگەی درێژەدان نیە بەو بابەتە.**

---

[٢٣] ازار: ئەو پۆشاکەیە کە لەسەرووی ناوکەوە بۆ خوارەوە ئەپۆشێت، ئەکرێ بەکوردی دەرپێ و شەروال و تەنوورەشی پێبووترێت، زانایانی سیرە کەباسی پێغەمبەر(صلی اللەعلیەوالەوسلم)ئەکەن لەشەودا ئەڵێن:( وکان ینام مع المرأة من نسائه في شعار واحد یضع عن کتفیه الرداء وینام بالإزار)، کاتێك لەگەڵ یەکێك لەخێزانەکانیدا لەژێر چەرچەفێکدا ئەخەوت، پەشتەماڵەکەی لەخۆی ئەکردەوەو تەنیا بەئیزارەوە ئەخەوت. بروانە(شهد الکلام في سیرة خیر الانام، بهجت بن فاضل بن بهجت).

[٢٤] أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ وَصَحَّحَ اَلْأَئِمَّةُ وَقْفَهُ(بلوغ المرام: ابن حجر:رقم الحديث: ٢١٠).

## گومانی دووەم

**حیجاب قورسەو هەڵناگیرێت، بەلأم ئیسلام ئاسانەو هەڵدەگیرێت**

**هەندێ کەس بۆ چەواشەکردنی خۆی یان بۆ چەواشەکردنی خەڵکی ئەڵێ: بەڕاستی حیجاب ئەرکێکی قورسەو جێبەجێکردنی زۆر گرانە بەتایبەتی لەهاوینی گەرمدا !!**

**لە وەلآمدا ئەبێت بڵێین:**

**ڕاستە ئیسلام و ڕێنماییە ئیسلامیەکان ئاسانن، خوای گەورە ئەفەرموێ:** ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾، **خوا ویستی ئاسانکاری هەیە پێتان نەك ویستی گرانکاری هەبێت پێتان، پێغەمبەریش(صلى اللهعليەوالەوسلم) ئەفەرموێ :** (إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إلا غَلَبَهُ، فَسَدِّدُوا، وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا)، **ئەم ئایینە ئاسانەو کەسیش نیە ئەم ئایینە لەسەر خۆی توونـدبکات و دین نەیخاتەژێرا کەواتەئێوە ڕێکوراست بڕۆن، لەیەکتر نزیکببنەوە، مژدە پەخشبکەنەوە (لەناو خەڵکیدا).. هەروەها ئەفەرموێت** («يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا، وَبَشِّرُوا، وَلاَ تُنَفِّرُوا»، **کار ئاسانبکەن و گرانی مەکەن، مژدە**

پەخشبکەن و خەڵك مەتۆرێنن.. سوفیانی سەوریش کەیەکێکە لەمامۆستاکانی ئیمامی شافعی ئەڵێ: ( الفقه رخصة من ثقة، والتحريم يحسنه كل حد)، تێگەیشتن لەدین دەرهێنانی روخصەتە بۆخەڵکی لەلایەن زانای متمانەدارەوە، حەرامکردن کارێکە هەموو کەس ئەیزانێت!

بەلآم ئەم ئاسانکاریە لەدیندا مانای ئەوە نیە هیچ ئەرکێك ناخرێتە سەرشانی موسڵمان کە گران بێت، یان هەرچی رێنمایی هەیە هەمووی سوك و ئاسانەو نەفس قەبوڵیانئەکات، بەڵکو وەك سەید قوتب-بەرەحمەتبێت- ئەڵێ : ئەم ئایینە هەم (رێگە پێدان=روخصەتی) تێدایەو هەم (هیمەتبەرزی=عەزیمەتی) تێدایە، دین نەئەمیانە بەتەنیاو نەئەویانە بەتەنیا، بەڵکو هەردووکیانە بەیەکەوە، مرۆڤ هان ئەدات بۆ ورەبەرزی و بەرەو کەماڵ رۆیشتن، بەلآم لەم رێگەی بەرەو کەماڵ چوونەدا جارجارە (روخسەت) دابەشئەکات بەسەر رێبوارانی ئەم کاروانە گەورەدا بۆ ئەوەی بگەنە هەوار، (سەید) بەرەحمەت بێت ئەڵێت : (ليس اليسر - في هذا المنهج - هو الترخص . ليس هو تجميع الرخص كلها في هذا الدين وجعلها منهج الحياة . فهذا الدين عزائم ورخص . والعزائم هي الأصل

والرخص للملابسات الطارئة . . وبعض المخلصين حسني النية ، الذين يريدون دعوة الناس إلى هذا الدين ، يعمدون إلى « الرخص » فيجمعونها ويقدمونها للناس ، على أنها هي هذا الدين . ويقولون لهم : انظروا كم هو ميسر هذا الدين! وبعض الذين يتملقون شهوات السلطان أو شهوات الجماهير ، يبحثون عن « منافذ » لهذه الشهوات من خلال الأحكام والنصوص؛ ويجعلون هذه المنافذ هي الدين!

وهذا الدين ليس هذا وليس ذاك . إنما هو بجملته . برخصه وعزائمه . ميسر للناس يقدر عليه الفرد العادي ، حين يعزم . ويبلغ فيه تمام كماله الذاتي – في حدود بشريته – كما يبلغ تمام كماله الذاتي في الحديقة الواحدة : العنب والخوخ والكمثرى والتوت والتين والقثاء . . ولا تكون كلها ذات طعم واحد . . ولا يقال عن أحدها : إنه غير ناضج – حين يبلغ نضجه الذاتي – إذا كان طعمه أقل مرتبة من النوع الآخر!

في حديقة هذا الدين ينبت البقل والقثاء؛ وينبت الزيتون والرمان ، وينبت التفاح والبرقوق ، وينبت العنب والتين . . . وينضج كله؛ مختلفة طعومه ورتبه . . . ولكنه كله ينضج . ويبلغ كماله المقدر له . .)[٢٥]..

---

٢٥ في ظلال القران، سيد قطب، ٦-فسيرى ئايەتى(٦٦)-سورەتى (النساء).

ڕاستە حیجابکردن سەرەتا لەسەر دەروون قورسە، بەلام بەئەزموون دەرکەوتووە کە لەپاشاندا لەسەر دەروون ئاسانئەبێت و ئەو کەسە بەتێپەڕبوونی کات ڕادێت لەگەڵیداو سادەو ساکار ئەبێتەوە، چونکە دەروون وەهایە: ئەرك سەرەتا گرانە لەسەری، بەلام هەر ئەوەندەی خووی پێوەگرت دەبێتە شتێکی ئاسایی و ڕۆتینی لەژیانیدا، بوەیصیری شاعیر- خاوەنی قەصیدەی بوردیەی بەناوبانگ- ئەفەرموێت :

النفس كالطفل ان تهمله شب على

حب الرضاع وان تفطمه ينفطم .

نەفس وەك منداڵێك وایە ئەگەر پشتگوێی بخەیت تا گەورە ئەبێت هەر داوای شیر ئەکات، بەلام هەر بڕیتەوە لەشیر ئیتر دوای ماوەیەك ڕادێت و لەشیر خواردن دوور ئەکەوێتەوە ..

خاڵێکی تریش ئەوەیە، کەس نییە لەپێناو بەدەستهێنانی ئامانجێکی خۆیدا قبوڵی ئەرکی قورس نەکات، بازرگانێك شەو ئەداتە دەم ڕۆژ بۆ ئامانجێکی دونیایی کەقازانجێکی کەمە یان زۆرە، قوتابیەك خۆی

لەهەموو چێژێکی دونیایی ئەگرێتەوەو دائەبڕێت لەهاوڕێیان و خزمـــان و تەنانـــەت خێزانەکـــەی خۆیشـــی بـــۆ ئـــەوەی نمرەیـــەکی بـــاش بەدەســـتبهێنێت و بڕوانامەیـــەکی بـــەرز وەربگرێت، کوڕێك دەیان ئەرکی قورس ئەخاتەسەرشانی و خـۆی لـەدەیان شـت بێبەشئەکات بۆئـەوەی ئـەو کچـەی بـۆ ببێت کە خۆشیئەوێت، کچیش بەهەمان شێوە، کەسی ژێر لەپێناو ڕاگرتنی باری تەندرووستی خۆیدا دەیان سیستەمی قورس و گران پەیرەودەکات وەك: ژەمی خواردنی تایبەت، وەرزشـێکی تایبـەت و بـەردەوام، خۆبـەدوورگرتن لەچـەندین خـواردنی چـەورو خـۆش و بـەتام، هـەموو ئەمانـە لـەپێناوی بەدەستهێنانی ئامانجێك کە هەر بەکەڵکی ئەم چەند ڕۆژەی دنیا دێت و شتێکی کاتییە چەندە تەمەنی مرۆڤ درێژ بێت .

دەی باشە ئافرەتێك ئەرکی گرانی حیجاب بخاتەئەستۆی و خـــۆی لەهەنـــدێ چـــێژی دونیـــایی خـــۆی بێبەشـــئەکات، بەئامانجی ئـەوەی پـەروەردگاری خـۆی ڕازیبکـات و بیخانـە بەهەشتی هەتاهەتایی خۆی، ئەوە شـتێکی زۆرە ئەگـەر بـاری قورســی حیجـابکردن بخاتـە سەرشـانی لـەم تەمەنـە کەمـەی دونیادا؟! باشـە کـەی ئـەوە زۆرە کـە ئافرەتێك بۆ ڕازیکردنـی

خواو هاوڕێیەتی کردنی پێغەمبەری خواو بۆ بەدەستهێنانی بەهەشتی هەتاهەتایی(دەروونی خۆی لەهەندێ شت بگرێتەوە، یان هەندێ ئەرکی گران بخاتەئەستۆی خۆی..)، پێغەمبەر(صلی اللەعلیەوالەوسلم) ئەفەرموێ: «مَنْ خَافَ أَدْلَجَ، وَمَنْ أَدْلَجَ بَلَغَ الْمَنْزِلَ، أَلا إِنَّ سِلْعَةَ اللَّهِ غَالِيَةٌ، أَلا إِنَّ سِلْعَةَ اللَّهِ الْجَنَّةُ»[٢٦]، هەرکەس لەقیامەت بترسێت، شەونخونی ئەکێشێت، هەرکەسیش شەونخونی بکێشێت ئەگاتە هەوار، ئاگاداربن شمەکی خوا بەنرخە، ئاگاداربن شمەکی خوا بەهەشتە!

خاڵێکی تریش کە شایەنی باسە ئەوەیە: دەروونی مرۆڤ بەشێوەیەك دروستکراوە لەپێناو ئامانجی گەورەدا شتی گەورەی لا بچوك ئەبێتەوە، کابرای بازرگان موجازەفەی وا ئەکات ژیانی ئەکەوێتە مەترسیەوە، بەڵام چونکە قازانجی ئەو کارەی ئەوەندە لا گەورەیە ئەو موجازەفەکردنەی لائاسانئەکات، قوتابیەکە چونکە بڕوانامەو نمرەی بەرزی لا گەورەیە، خۆ بێبەشکردن لەساڵێك خۆشی و ڕابواردنێکی کاتی لەلائاسانئەبێت و لەلای بچووك ئەبێتەوە، کابراش

---

[٢٦] شرح السنة، البغوي، رقم الحديث:(٤١٧٣).

کەبەدوای لەشساغی و ڕەشاقەتدا ئەگەڕێ ئەو هەمووە وەرزشە قورسە و ئەو هەمووە ڕێجیمەی لائاسان و سادە ئەبێتەوەو گرانی و قورسی نامێنێ لەسەری، حیجابکردنەکەش بەهەمان شێوەیە ... بەلاَم کەسانێکی تر کە وەك ئەوان نین سەیریان دێ لەو خۆڕاگری و خۆڕەنجاندنەی ئافرەتی بالاَپۆش، جار جارە گاڵتەشیان بەعەقڵیان دێت کە بۆچی بەو شێوەیە خۆیان ئەڕەنجێنن؟!

ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب ئەفەرموێ : ( ما ابتليت ببلاء الا كان لله علي فيه اربع نعم: اذ لم يكن في ديني، واذ لم يكن اعظم، واذ لم احرم الرضا به، واذ ارجو الثواب عليه ) [27]

واتە: هیچ بەلاَیەکم نەهاتووە بەسەردا چوار نیعمەتی خوام تێدا نەبینیبێت: ئەوبەلاَیە لەدینم نەکەوتبوو، لەو بەلاَیە گەورەتر نەبوو، بێبەش نیم لەرازیبوون بەبەشی خوا، ئومێدم هەیە پاداشتی لەسەر وەربگرم.

کەواتە خوشکی سەرپۆشبەسەریش پێویستە کەدەروونی هەرجارێك وەسوەسەی بۆ درووستکردو وتی: ئەم حیجابە

[27] مختصر منهاج القاصدين، المقدسي:( ٤/٢١) .

چەند قورسە! خۆزگە حیجاب فەرز نەبوایە، خۆزگە منیش پیاو بوومایەو حیجابم نەکردایە !.. ئافرەتی حیجابلەبەر پێویستە لەوکاتانەدا بڵێ:

*ئەم حیجابە ڕێگەیە بۆ چوونەناو دین نەك هاتنەدەر لەدین.

*میللەتانی پێش ئێمە ئەرکی لەمە گەورەتریان لەسەر شان دانرابوو.

*من بەم حیجابە ڕازیم کە خوا لەسەری فەرزکردووم.

*لەسەر ئەم حیجابەم پاداشت وەرئەگرم و خوا ڕازیئەکەم.

*ئەم حیجابەم مایەی ڕێزو ناساندنمە لە دونیادا(ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ)

*ئەم حیجابەم دەیان سوودی تێدایە بۆ جەستەو عەقڵو ناموس و گیرفان و دونیاو ئاخیرەتم.

*دونیا تەمەنێکی کەمە، لەچاوتروکانێکدا تەواوئەبێت، بۆ من هەروایە بۆ بێحیجابەکانیش هەروایە، کەس نازانێ لەپڕێکدا مردن بەردرگای پێ ئەگرێت و مەحوی واتەنی:

(ئەجەل دەورەم دەدا، حازربە! وەعدەی دەورو تەسلیمە
من غەفڵەتزەدە هێشتا خەریکی مەسئەلەی دەورم

ئەوان ئەمرن و منیش ئەمرم، ئەوان کە ئەمرن ئیتر چێژو خۆشیان تەواوئەبێت، بەلام چێژو خۆشی من دەستپێئەکات، ئەوان سزایان دەستپێئەکات، من ئەرك و سزام لەکۆڵ ئەبێتەوە، شاعیرەکە ئەڵێ:

ئێوارەی ژین بەسەردا هات ناچاری بازاڕ هەڵبگری
بەروە ماڵی گۆڕی تارت بەتەنیا ملی ڕێ بگری
گوناهتکرد تامی ڕۆیی، سزاکەی واچاوەڕێتە
دەفرمێسکی پەشیمانی هەڵوەرێنە هەتا ئەمری

یان شاعیرەکەی ئەندەلوس ئەڵێ:

لا تنم و اغتنم مسرة یوم ....ان تحت التراب نوم طویلاً

مەخەوە! شادی ڕۆژێك بەدەرفەت بگرە، لەژێر گڵدا خەوێکی درێژ ئەکەی.

## گومانی سێیەم

**حیجابی سەردەم ئەگەر (تەسك) و( تەنك)یش بێت هەر حیجابە!**

هەندێ ئافرەتی حیجابلەبەر لەژێر فشاری ڕاگەیاندنی چەواشەدا ئەڵێن: ئەگەر بەپێی مۆدێلات رەنگ و جۆری حیجابەکانمان بگۆڕین گوناه نیەو خۆگونجاندنە لەگەڵ سەردەم و زەمانەدا! زانایانیش ئەڵێن: ئیسلام بۆ هەموو سەردەم و شوێنێکەو فەتواش بەپێی کەس و کات و شوێن ئەگۆڕێت: ( الفتوى يتغير زماناً ومكاناً وشخصاً).

ئەم گومانە زیاتر لەوەسوەسە ئەچێت تا گومانێك بێت و باسبکرێت .. وەك لەبڕگەی پێشوودا ووتمان: حیجاب ئەرکێکی قورسە لەسەر دەروون، بۆیە نەفس بەهەموو شێوەیەك لەهەوڵی ئەوەدایە: ئافرەت بڕیاری بالأپۆشی نەدات، ئەگەر ئەو بڕیارەشیدا ئەوە نەفس و شەیتان هەوڵئەدات کە کەلێن و کەلەبەری زۆر بخاتە ناو ئەو بڕیارەی.

ئیبن قەییمی جەوزییە -بەرەحمەت بێت- ئەڵێت: شەیتان ئەگەر نەیتوانی مرۆڤ لەتەواوی خێر بێبەش بکات،

هەوڵئـەدات خێـری تـەواوی دەسـتنەکەوێت.. یـانی ئەگـەر بۆینـەکرا بەهـەر گومـان و وەسوەسـەیەك ئافرەت لـە(تـەواوی حیجاب) دووربخاتەوە، ئەوە هەوڵئەدات لە(حیجابی تەواو)ی دووربخاتەوە.

بـۆ نمونـە: پێیئـەڵێت: حیجـاب شاردنەوەی گۆشـت و پێسـت و قـژە، ئـیتر چـی تێدایـە ئـەو حیجابـە بـەمۆدێلێکی سەردەمانە بێت، چی تێدایە کەمەرەکەی تۆزێك تەسکبێت، دامەنەکەی تۆزێك لەسەرتر بێـت، ڕەنگەکـەی تۆزێـك کراوەتـر بێت، یەخەکەی تۆزێك فراوانتر بێت!

ئەمانە هەمووی لەناو ئەو ئایەتەدا جێـی ئەبێتـەوە کـە ئەفــەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا ادْخُلُـوا فِي السِّـلْمِ كَافَّـةً وَلَا تَتَّبِعُـوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُـمْ عَـدُوٌّ مُبِينٌ﴾، ئـەی کەسـانی ئیمانـدار! هــەمووتان بچــنەناو هــەموو جومگــەکانی ئیســلام و شــوێن هـەنگاوەکانی شـەیتان مەکـەون، چـونکە شـەیتان دوژمنێکـی ئاشکرای ئێوەیە .

ئیبنولقەییم لـەکتێبی(بـدائع الفوائـد)دا ئـەڵێ: شـەیتان شـەش تەڵـە ئەنێتـەوە بـۆ هـەموو مرۆڤێـك بـەو هیوایـەی کـە بەیەکێك لەو تەڵانەوە ببێت:

تەڵەی یەکەم: شیرك و بێدینی: چونکە بڕوای وایە هەرکەس ببێت بەم تەڵەوە ئەوە ئیتر بەمسۆگەری ئەبێتە هاوڕێی لەئاگردا ..

تەڵەی دووەم: بیدعەو دەستکاریکردنی دین: چونکە بڕوای وایە کە هەرکەس ببێت بەم تەڵەیەوە ئەوا بیر لەتۆبەکردن و پەشیمانبوونەوە ناکاتەوە تا ئەکەوێتە ناو شیرك و بێدینی.

تەڵەی سێیەم: گوناهە گەورەکان: چونکە دڵنیایە کە بەکردنی ئەو گوناهە گەورانە شایستەی ئاگری جەهەنەم ئەبێت.

تەڵەی چوارەم: گوناهە بچوکەکان: چونکە شەیتان بڕوای وایە کە ئەم گوناهە بچوکانە کەڵەکە ئەبن و ئەوەندە زۆر ئەبن لەسەر کەسی گوناهبار تا بەهیلاکیدا ئەبەن[28]

---

٢٨ پێغەمبەر (صلى الله عليەوالەوسلم) ئەفەرموێت: ( ان الشيطان قد يئس ان يعبد ولكن يرضى منكم فيما تحتقرون من اعمالكم) مجمع الزوائد. شەیتان لەوە بێئومێد بووە کە بیپەرستن، بەڵام بەوە لێتان رازی ئەبێت کە لەو گوناهانەدا بەگوێی بکەن کە لای خۆتان بچوك و هیچن.. هەروەها ئەفەرموێت: ( يا عائشة ! اياك ومحقرات الاعمال، فان لها من الله طالباً) و في لفظ: ( اياكم و محقرات الذنوب، كقوم نزلوا في بطن واد، فجاء هذا بعود و هذا بعود، حتى انضجوا خبزتهم، و ان محقرات الذنوب متى يؤخذ بها صاحبها تهلكه..) ذكره الهيثمي في المجمع (١٠/١٩٠).

تەڵەی پێنجەم: سەرقاڵکردنی بەحەلاڵەکانی دنیاوە، چونکە شەیتان ئەزانێ کەسەرکردنە دنیاو ڕۆچوون تێیدا جۆرێك لەبێئاگایی دروستئەکات و ئەو بێئاگاییەش لەزۆر ئەرك و واجباتی سەرشانی بێئاگایئەکات و بەوەش قەرزاری لای خوای ئەکات بەهۆی نەکردنی فەرزەکانەوە، یان بەهۆی کردنی هەندێ لەحەرامەکانەوە لەپێناو کۆکردنەوەی دنیادا..

تەڵەی شەشەم: ئەیپێچێتە ئەو شتانەی کە بەڵگەو ئەزموون سەلماندوونی لەئەوان چاکتر هەیە، بۆنموونە: سەرقاڵیئەکات بەزیکرەوە تانەچێت بۆ دەرسوتنەوە، یان سەرقاڵیئەکات بەخۆی و ماڵ و منالێیەوە تاخەمی میللەت و دین نەگرێتە ئەستۆی، یان سەرقاڵی عیبادەت و دەرسوتنەوەی ئەکات تا نەچێت بەهۆڵ سیاسەت و دەسەلآت وەرگرتنەوە.[29]

---

عائیشە! دووربە لەو کارانەی کە بە هیچیان ئەزانی، چونکە لەلایەن خواوە داواکاری خۆی هەیە..لەفزەکەی تری ئەفەرموێ: بەدووربن لەگوناهە هیچەکان، ئەو گوناهانە وەك کۆمەڵە خەڵکێك وان کە ئەچنە دۆڵێك و ئەمیان چیلکەیەك دێنێ وئەویان چیلکەیەك دێنێ تا نانەکەیانی پێئەبرژێنن، گوناهە هیچەکان هەرکات لێپرسینەوە لەگەڵ خاوەنەکانیاندا کرا بەهیلاکیدا ئەبەن!!

[29]. ئەم شەش خاڵە بەمانا وەرگیراوە لە کتێبی ( بدائع الفوائد )ی ئیبنولقەییم نەك بە دەق .

کەواتــە شــەیتان هەمیشــە لەهــەوڵی ئەوەدایــە کــەئافرەتی بـالآپۆش بخاتـەناو بەرنامەیەکـەوە هـەنگاو بەهـەنگاو لـەدین دووریبخاتەوە، بەڵام ئەگەر ئەو ئافرەتە:

یەکــەم/ دەســـتی بەدینـــەوە گـــرت و لەشـــیرك و بێـــدینی دوورکەوتەوە .

دووەم/ دەســتی بەســوننەتەوە گــرت و لەبیدعــەو داهێنــان دوورکەوتەوە.

سێیەم/ لەگوناهـە گـەورەکان خـۆی بـەدوورگرت و فـەرزەکانی بەجێهێنا.

چــوارەم/ خــۆی پاراســت لەگوناهــە بچــوکەکان و نــەیهێلاً لەســـەری کەڵەکـــەبن و بـــەردەوام بەتۆبـــەو کـــاری چـــاك ئەیسڕینەوە..

پێنجەم/ ئەوەنـدە خـەریکی دونیا ئەبوو کە پێویست بێت و بێئاگای نەکات و غەڕرا نەبێت.

شەشـەم/ بـەکاری چـاکترەوە خـۆی سـەرقاڵئەکرد نـەك تـەنها کـاری چـاك.. ئـەوە دەسـتەبەری بەهەشـت و ڕەزامەنـدی خـوا ئەکات بۆ خـۆی و ئەوەنـدەش نـوورو بەرەکـەتی بـۆ ئەچێت

لەلای پەروەردگاریەوە کەشەیتانەکەی کزببێت و نەتوانێت فریویبدات و بیخاتەناو تەڵەو بەرنامەکانی خۆیەوە ..
خوای گەورە ئەفەرموێ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَتَّقُوا اللَّهَ يَجْعَلْ لَكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ﴾، ئەی ئیمانداران ! ئەگەر خۆتان لەزویربوونی خوا بپارێزن ئەوە خواش جیاکەرەوەیەکتان پێئەدات و لەگوناهەکانیش پاکتانئەکاتەوە، ئیبن تەیمیەش -بەرەحمەت بێت- ئەڵێت:(فرقاناً) یانی: نورێکی بۆ درووستئەبێت کە بەو نورە هەق و ناهەق جیائەکاتەوە لەیەکتری، ئەولیای خوا لەئەولیای شەیتان و شەرعی(منزل) لەشەرعی(مؤول)و (مبدل) جیائەکاتەوە [30].
لەبەر ئەوەیە ئەبێت بڵێین: شوێنکەوتنی بێسنوری مۆدێلاتی حیجاب و گوێنەدان بەڕەنگەکەی و قەبارەکەی و ئەستوریەکەی .. هەنگاوێکە بۆ دەستبەردان لەبالاْپۆشی.. حیجاب بەکورتی و کوردی بریتیە لەشاردنەوەی جوانیەکانی

---

[30] بە مانا وەرگیراوە لەکتێبی(الفرقان بين اولياء الرحمن و أولياء الشيطان).

ئافرەت لەنامەحرەم، هەموو نامەحرەمێك: بێگانە بێت یان خزم، دوور بێت یان نزیك، لەماڵدا بێت یان لەدەرەوە بێت.
ئەمە ئەرکێکی قورسە؟ بەڵێ: قورسە !! بەڵام سەلامەتی دونیاو ئاخیرەتی پێوە بەندە، سەلامەتی ئیمانی خۆت و ئیمانی بەرامبەرەکانی تێدایە، خێرە بۆخۆت و خانەوادەو کۆمەڵگەکەت، خێرە بۆ ئێستات و بۆ داهاتوشت، خوا وەك چۆن رێگە لەتۆ ئەگرێت ماڵی هیچ کەسێك وێراننەکەیت بەوەی جوانیەکانت بخەیتەدەرەوە بۆ هەموو کەس، بەهەمان شێوە رێگە لەخەڵکی تر ئەگرێت و نایەڵێت جوانیەکانیان بخەنەدەرەوەو ماڵی تۆی پێوێران بکەن، دڵی مێردەکەت بەلای جوانی جەستەو جوانیەکانی تریاندا رابکێشن..
ئەمە شتێکی مەنتیقیە، هەموو ئافرەتێك کاتێك سەرنجی پیاوێك بەلای خۆیدا رائەکێشێت ئەوە ماڵی ئافرەتێکی تر وێراننەکات، ئەو ئافرەتە ژن بێت یان دەستگیراندار بێت یان تەنانەت ئەگەر پیاوێکی بێ گرێبەستیش بێت و هێشتا نەکەوتبێتە ئەو خولیایانە.. چونکە بەو کەمەندکێشکردنە فێری راوکردنی ئافرەتان ئەبێت، کامیان مەکربازتربێت قاچی بەتەڵەی ئەوەیانەوە ئەبێت .

## گومانی چوارەم
## حیجاب هەستی سێکسی خەفەئەکات!

هەندێ کەس دژ بەبالاپۆشی چەندین گومانی ئاڕەوا بەحیجاب ئەبەن و ئەڵێن:

حیجابکردن و خۆشاردنەوە بەحیجاب هەستی سێکسی لەئافرەتاندا ئەمرێنێ!! بەپێچەوانەشەوە ئەم بالاپۆشییە هەستی سێکسی لەکوڕاندا ئەوروژێنێت و ئەیانخاتە هەڵپەکردن بەدوای سێکسدا، بەڵام ئەگەر هات و ئافرەتان دەستبەرداری بالاپۆشی بوون ئەوا هەم هەستی سێکسی لەخۆیاندا زیندوو ڕائەگرن، هەم هەستی سێکسی پیاوانیش کەمئەکەنەوەو هەڵپەیان ناهێڵن..

ئەم قسەیە نەقسەیەکی زانستیەو نەقسەیەکی مەنتیقیەو نەقسەیەکی نیازپاکانەشە، بەڵکو قسەیەکە بۆنی هەوەسبازی و جۆرێك لەپیلان و بێعەقڵیشی لێدێت..

ئەمەیان کەقسەیەکی زانستی نیە ئەوەیە کەزانست دەریخستووە:

*جوڵـەی سـپێرم و هێلکـە لـەکاتی گەیشـتن بەیەکـدا دوو جوڵـەی زۆر جیاوازیـان لەیـەکتری هەیـە (سـپێرم) کـە تـۆوی پیـاوە زۆر تەماشـای ئـەملاولا ئـەکات و درێوانـە دێـت و ئەڕوات، بەڵام هێلکە کاتی هاتنەخوارەوەی بۆ ناو ڕەحم زۆر هێمن و شەرمنانە دێتەخوارەوە ..

*زانسـت دەریخسـتووە کەوەڵامدانـەوەی کوڕان و پیاوان بـۆ سـەیرکردنی ڕەگـەزی بەرامبـەر زۆر خێـراو بـەهێزە، بەپێچەوانەی کچان و ژنانەوە، ئەم تاقیکردنەوانە لەسەر ئەو کەسـانە کـراوە کـەفلیمی سێکسـی و وێنـەی ئافرەتانیـان پیشاندراوە، بینراوە کە کاردانەوەی کوڕان زووترو بەهێزترە لەژنان.

*هـەر لەبـەر ئەمەیـە کەپێغەمبـەری ئیسـلام (صـلی اللهعلیهوالهوسلم) ڕێگری لەوە کردووە کە ژن باسی ژنێکی تر بکات بۆ مێردەکەی، چونکە هەر بەو باسکردنە پیاوەکە توانای بەرجەستەکردنی ئەو ژنەی تری هەیەو خێرا وێنەی ئەو ئافرەتە لەزیهنیدا ئامادەئەکات!!

وردەکاریـەکی سـەیر هەیـە لەقورئانـدا: کاتێـک باسـی چاوداخستن ئەکات و فەرمانئەکات کە پیاوان و ژنان چاو

لەئاست یەك دابخەن و نەزەر لەیەكتری نەكەن، لەپێشدا فەرمان بەپیاوان ئەكات چاویان بگرن و شەرمگەیان بپارێزن، پاشان فەرمان بەئافرەتان ئەكات .. ئەمەش جۆرە ئیعجازێكە كەزانستی تازە دەریخستووە وەلآمدانەوەی پیاو زووترو بەهێزترە لەوەلآمدانەوەی ئافرەت [٣١].

بەڵگەش لەسەر ئەوەی كەئەڵێین: ئەو قسەیە جۆرێك لەپیلان و بێئەقڵی تێدایە ئەوەیە:

هەموو ئەو ڕەوتە تازانەی كە لەدونیای ئیسلامدا درووستكراون بۆ ئافرەتان، هەموو بانگەشە بۆ ئەم كارە دەكەن و سەرسەختانە داوای فڕێدانی حیجاب و پەچەو عەبا ئەكەن... ئەوەتا لەشوێنێكی وەك میسر سەرەتای ڕەوتی ئازادی ئافرەتان بەبزوتنەوەكەی(قاسم ئەمین)و (هودا شەعراوی) دەستیپێكرد، كە قاسم ئەمین بەڕاشكاوی ئەڵێت:( بۆ ئەوەی ئازادی بۆئافرەتان دەستەبەربكەین

---

[٣١] .سەیری نوسینێكی د.ابراهیم طاهیر بكە بە ناوی ( پیاوان و ژنان تەواوكەری نایەكسان) ل(٢٥٧-٢٦١ ).

پێویستە یەکەم هەنگاو دەستپێبکەین ئەویش ئەوەیە: سەرپۆش و حیجابەکان بدڕێنین و ئەو کۆتە بشکێنین).[32]
لای خۆشمان هەر لەپەنجاکانەوە ڕەوتێکی واهەیەو تاکە مەبەستی ئەوەیە ئافرەتان هەرزانفرۆش بکات و پەلاماری حیجاب و سەرپۆشەکانیان بدات و دایبماڵێت لەبەریان: مەگەر بێکەسی شاعیر واناڵێ:

نەسرین دەمێکە داخت لە دڵمە
گیرۆدەو بەندی حەیاتت زوڵمە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمە

یان عەبدولخالیق مەعروف لەهەشتاکاندا ناڵێت:
(حیجاب نەریتێکی عەرەبیەو هاتوەتەناو کۆمەڵگەی کوردەواری و پەیوەندی بەئیسلامەوە نیە )...
لەم ٢٠١٣ شدا یەکێکی وەك د.حسێن محمد عزیز ئەڵێ:(حیجاب فەرزنیەو نەریتێکی عەرەبەو بەزۆر سەپێنراوە بەسەر کچ و ژنی کوردەواریدا) .. نەك ئەمە بەڵکو کەسی وا

[32]. المراة الجديدة ، قاسم امين ، لاپەڕە ٣٨ .

دروستبووە لەم کوردستانەدا کە تەواو هەستیار بووە بە بالآپۆشی و دیاردەی بالآپۆشی، بەبێ هیچ پاساوێك!
بۆ نمونە: دکتۆر حسین کەمامۆستایەکی زانکۆی سلێمانیە بەدیاردەی بالآپۆشی ئەوەندە پەستبووەو رقی لەو دروشمە هەستاوەو حەساسییەتی بەو دیاردەیە بۆ دروستبووە گەیشتووەتە ئەوەی حکومەت هانئەدات کەسنوور بۆ ئەو دیاردەیە دابنێن و نەیەڵن زیادبکات! زەنگی ترسناکی بۆ حکومەت لێئەدات و پێیانئەڵێت: ( ئەبێ کاربەدەستانی میری هەرێم سنووری بۆ ئەو لاسایی و گاڵتەجارییە دانێن تا لەئایندەدا بەتەواوی بلأونەبێتەوەو زانکۆکان وەك شارێکی نامۆو نەناسراوی لێنەیەت!).
ئەم هەستیاربوونە زیادەیە بەدیاردەی بالآپۆشی و هاندانی حکومەت بۆ ئەوەی نەیەڵێت بلأوبیبێتەوە هەم بێ پاساوەو هەم جۆرێك لەئیرهابی فیکریشی تێدایە کە حکومەت هەڵبنێت بۆئەوەی ئازادیە شەخسیەکان بخنکێنێت و زەوتیانبکات، لەولآتە گەشەسەندوو خواپێداوەکاندا ئافرەتان ئازادئەکرێن بۆ ناو پەرلەمان بەحیجابەوە بچن،

کەچی دکتۆر حسین تازە ئەیەوێ بالآپۆشی یاساغبکات لەزانکۆکانی کوردستاندا.

هەر ئەمەش نا، بەڵکو هەندێ کەس تۆمەتی بەدڕەوشتی ئەدەنەپاڵ ئافرەتانی بالآپۆش و ئەڵێن:(سەیرئەوەیە، زۆربەی هەرەزۆری ئافرەتانی ولآتە ئیسلامیەکان لەچك ئەبەستن، بەلآم ئەو بێڕەوشتی و خراپەکارییەی کەلەئەو ولآتانەدا هەیە لەکەم ولآتی دیکەدا هەیە)!!

هەروەها ئەڵێن:(ئایا لەژێر ئەو ئەو عەباو چارشێوانەدا قۆپی ناکەن؟)یان ئەڵێن:(کچان بەقەناعەتەوە لەچکیان نەکردووە... بەزۆری دایك و باوکیان لەچکئەکەن... ناچارکراون لەچکبکەن...)!!

وەك وتمان: ئەم بانگەشەکردنە بۆ بێحیجابی جۆرێك لەبێعەقڵیشی تێدایە، چونکە ئافرەت بەخۆدەرخستنی زیادەی نەك پیاوان ئارامناکاتەوە بەڵکو زیاترو زیاتر ئەیانوروژێنێت و بەهیچیش دانامرکێنەوە بەوەنەبێت دەستیان بگەیەنن پێیان..

ئـەم قسـەی ئـەوان وەك ئـەوە وایـە بلّـێن: ئەگـەر یـەكێك تینوویبوو ئەوە بەردەوام ئاوی نیشانبدەو ئاو لەبەردەمیدا ڕۆبكـە، ئـیتر ئارامدەبێتـەوەو تینوێتیەكـەی ئەشـكێت!! دەی ئەمە بێعەقڵی و دژی واقیع نیە ؟!!

ئایا كەسێك تینووبێت و ئاو لەبەردەمیدا ڕۆبكـەیت زیـاتر كـوێڕایی دادێـت بـۆ ئاوەكـە، یـان تینوێتیەكـەی ئەشكێت؟! ئەو كارە ئازاری ئەدات یان ئارامی پێئەدات؟ ئەی ئافرەتێك كەحیجابلەبەر نەبێت و شوێنە هەستیارەكانی وەك سنگ و بەرۆك و قاچ و قول و قۆڵ و باڵی بەردەوام نیشانی پیـاوان بـدات ئایـا تینـوێتی سێكسـییان زیاترئـەكات یـان تینوێتیان ئەشكێنێ و هەستی سێكسییان ئارامئەكاتەوە ؟!

ئایـا ئـەوەی تینوویـەتی بـەدەم گەیشـتنی بەئاوەكـە تینوێتیەكـەی نـامێنێ یـان بـەئاو ڕۆكـردن لەبەردەمیـدا و دیقكـردن پێـی؟ ئایـا سێكسـی وروژاوی پیـاو بەگەیشـتن بەئافرەت و سەرجێیكردن لەگەڵیدا دائەمركێتەوە یان بـەوەی بەردەوام فیلم و وێنـەی ئافرەتی بێحیجابی پێنیشـان بـدرێت ..

کەواتە حیجاب و بالاپۆشی بۆ ئەوەیە کەهاوسەنگی جنسی درووستبکات لەناو کۆمەڵگەدا، وروژاندن کەمبکاتەوە، کاری سێکسی سنوردار بکات لەناو بازنەی خێزانداو ئامانج لێی بریتیبێت لەنەوە خستنەوەو ڕاگرتنی پاکیزەیی و پاراستنی(ئاسایشی خێزانی) کە ئەو سێ ئامانجە گەورەترین ئامانجن لەپرۆسەی زەواج و سێکس کردندا ..

مامۆستا محمد قوتب لەکتێبی(معركة التقاليد)دا باسی ئەوە ئەکات: تەنانەت ئاژەڵانیش ئامانجیان لەسێکسکردن بریتیە لەنەوە خستنەوەو زۆرکردنی ڕەگەزی خۆیان و کارەکەیان سنوردارە لەو ئامانجەدا، بۆیە کاتی تایبەتیان بۆ ئەو پرۆسەیە، کە ئەو کاتەش هات ئاژەڵە مێینەکان، بەهۆی هۆڕمۆنێکەوە کە بۆنێکی تایبەتی هەیە ئاژەڵە نێرینەکانی پێئەوروژێنن تا پرۆسەی جوتبوون ڕووبدات، کاتێکیش ئەو ئامانجە هاتەدی و سپێرمەکە کاری خۆی کرد، هۆرمۆنێکی تری جیاواز دەرئەکات و وروژاندنی نێرینەکان دائەمرکێنێتەوەو ئیتر ناکەونە شوێن ئاژەڵە

مێینەکـــــە.[٣٢] کەواتـــــە خۆدەرخســــتنی ئافرەتـــــان و خۆڕازاندنـــەوەیان بەهـــەق و ناهـــەق کـــارێکی نازانســـتی و نادڵسـۆزانەو ناعەقڵانەیـە .. بـە پێچەوانەشـەوە، حیجـاب و بالآپۆشی هەم شتێکی زانستیەو هەم کارێکی دڵسۆزانەیە بۆ پیاویش و بۆ ئافرەتیش، هەم کارێکی عاقڵانەو ژیرانەشـە بـۆ پاراســتنی پرۆســەی زەواجکــردن و ئاسایشـــی خێزانـــی و مەحکەمکردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لەسەروو هـەموو ئەمانەشـــــەوە: حیجـــــاب و بالآپۆشـــــی وەســـــیلەی خۆنزیککردنەوەیـە لەپـەروەردگارو زەخـیرەی قیامەتـە بـۆ ئەوانەی بڕوایان بەخواو بەقیامەت هەیەو دڵنیان لـەوەی کـە ڕۆژێـک دێـت کـە ڕووبـەڕووی پـەروەردگاریان ئەبنـــەوەو لێپرســــینەوەیان لەگەڵـــدا ئـــەکات و لێیانئەپرســـێت: هەڵوێستیان چـی بـوو لەپەیامـەکانی ئـەوو پەیامبـەرەکانی ئەو، خـوای گـەورە ئەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژە بانگئـەکرێن و پێیـان ئـەوترێت: ئادەی وەڵامی پێغەمبەرانتان چۆن دایەوە؟

---

[٣٢].سەیری کتێبی ( معركة التقاليد )ی محمد قطب، ل١٢١ بکە .

## بەشی سێیەم
## بەرنامەیەك بۆ حیجابکردن

زۆر ئافرەت کە لەبناغەدا موسڵمانن کاتێك ڕووبەڕوو ئەبنەوە لەگەڵ ئەو ئایەتانەدا کە حیجاب فەرز ئەکەن دائەچڵەکێن و ترس لەسزای خواو زوویربوونی پەروەردگار ئەیانگرێت و ئەکەونە هەڵوێستێکی ترسناکەوە .. نازانن تاکەی بەردەوام بن لەسەر بێ حیجابی؟ تاکەی تەسلیمی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا(صلی اللەعلیەوالەوسلم)نەبن؟ بیردەکەنەوەو ئەلێن بەخۆیان: تۆبڵێی مەرگ ڕێگەمانبدات لەکوێدا خۆمان ویستمان و بڕیاریاماندا ئەوکاتە حیجاب بکەین؟

لە(عەلا خانم)ی ئەکتەری ناسراوی میسریان پرسی بۆچی حیجاب ناکەی؟ ئەویش لەگۆڤاری (الکواکب)دا ئەڵێت: بەڕاشکاوی بڵێم: من بڕوام وایە کە حیجاب یانی خۆشاردنەوە لەچاوی خەڵکی نامەحرەم، بۆ ئەوەش بگەیتە ئەو پلەیە پێویستە بڕێك زوهدو دونیانەویستیت تێدا بێت، ئەوکاتەش تەنیا بیرت لای ڕازیکردنی خوایەو بیرت هەر لای ئاخیرەت و خێزانەکەتە.

جا کەگەیشتمە ئەو قۆناغە ئەوە حیجابئەکەم و خۆم لەچاوی خەڵکی(بێگانە) ئەشارمەوە)[٢٤]

ئەم ئەکتەرە ئافرەتە روونتر ئەڵێ:(من وا ئەبینم کەبڕیاری یەکجاری حیجابکردن کاتێك ئەبێت کەجۆرێك نزیکبوونەوەت لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بۆ درووستببێت)[٢٥].

[٢٤].گۆڤاری ( الكواكب) ، بەداخەوە ژمارەی گۆڤارەکەم چنگنەکەوت لەکاتی ئەم نووسینەدا.

[٢٥].ئیسلام کارێکی گرنگ ئەکات لەگەڵ ئەم مرۆڤەدا: خێرو شەڕی بۆ پێناسە ئەکات، هانیئەدات خێرەکە بکات، ئەیترسێنێت لەکردنی شەڕەکە، بەبەڵگەوە باسی ئەو خێرەو خراپی ئەو شەڕەی بۆ باسئەکات، ئەوجا لێئەگەڕێت تا(عەقڵ)و (دڵ)ی بکەونە ململانێ، بەمەش هەم عەقڵی فێری بیرکردنەوەو بڕیاردان ئەکات، هەم دڵ و دەروونیشی فێری گوێڕایەڵی عەقڵئەکات، بەدروستکردن ململانێ لەنێوان عەقڵ و عاتیفەدا زۆرجار عەقڵەکان ئەیبەنەوەو دێنە بەرەی دین ئەگەر زانیاری پێویست بدرێت بەعەقڵ، بەڵام ئەوانەش هەوەسپەرستن و گوێ بەعەقڵیان نادەن ئەدۆڕێن و ئەکەونە داوی نەفس و شەیتانەوە، ئەگەر براوەی ئەم دونیایەش بن ئەوە دۆڕاوی ئاخیرەت ئەبن، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ( أولئيك الذين خسروا أنفسهم وأهليهم يوم القيامة)، ئەوانە هەم خۆشیان لەدەستئەدەن و هەم خێزانەکانیشیان لەدەستئەدەن لەرۆژی قیامەتدا.

ئەوانەی کە لایان قورسە بڕیاری حیجابکردن بدەن بەبۆچوونی من چوار ڕێگری گەورە لەبەردەمیاندا هەیەو ئەبێ تێیانبپەڕێنن:

١-حیجابیان لا قورسەو ئەترسن بۆیان هەڵنەگیرێت .

٢-لەگاڵتەی خەڵکی ئەترسن .

٣-نەفسیان زاڵمەو حەز بەو قژ بەردانەوەو سەرو سنگ دەرخستنە ئەکەن و چێژی لێئەبەن.

٤-ئاگایان لەو هەموو هەڕەشەیە نییە کەلە ئافرەتی بێحیجاب کراوە لەلایەن خواو لەلایەن پێغەمبەری خواوە(صلی اللەعلیەوالەوسلم) ..

بۆیە پێویستە:

١-خۆیان شارەزا بکەن لەو ئایەت و حەدیسانەدا کە دەربارەی خێری حیجابکردن هاتوون، هەروەها خۆیان شارەزا بکەن لەو ئایەت و حەدیسانەی کە هەڕەشە لەئافرەتی بێحیجاب ئەکەن، دوای ئەوە ئیتر خۆی سەرپشك بکات و چاوەڕوانی ئەو زۆرانبازیەبێت کەلەنێوان عەقڵ و

عاتیفەیـدا رووئـەدات تـابزانیّ: ئایـا عـەقڵی ئەیباتـەوە لەعاتیفەی یان عەقڵی ئەدۆڕێت بە عاتیفەی.[36]

٢-ئەبیّ کەمێك جڵەوی نەفسی خۆیان توندبکەنەوەو پێی بڵێن:

بەزایەع چوو لە مالا یەعنی وەقتم هەموو یەعنی
ئەبیّ وەقتیّ لەبولوەقتیّ بخوازم تا تێیا بمرم
ئەجەل دەورم دەدا حازربە وەعدەی دەورو تەسلیمە
منی غەفڵەتزەدە هێشتا خەریکی مەسئەلەی دەورم
سبەینیّ یحشر المرو براگەل فرسەتە ئەمڕۆ
تەبەڕا بن لەمن باکەس نەبیّ حەشری لەگەڵ حەشرم
ئەمن نازانم ئیتر نەفسی بەدخوو چی دەویّ مەحوی
کەبەدکرداو بەدرەفتارو بەدئەفکارو بەد طەورم
مەگەر بەرمەوجی عەفوی خۆیم خا وەسفی سەتتاری
وەگەر نا رەحمەتە پابوونەوەم ناموومکینە سەترم

ماناى ئەو شیعرانە بەکورتی: هـەموو تەمـەنم رۆیشت لەشـتانێکدا کـەبێهوودەو بێسـوود بـوون بـۆم، پەیوەنـدی

---

[36].سەیری کتێبی ( معرکة التقالید )ی محمد قطب بکە .

راستەوخۆیان بەژیانی منەوە نەبوو، ئێستاش کەتەمەن کەمێکی بەبەرەوە ماوە مەگەر داوا لەخاوەنی کات و زەمان بکەم کەخوایە کاتێکی گونجاوم پێببەخشێت تا تێیدا تۆبەیەکی راستەقینە بکەم و بەئاسوودەیی و کامەرانی تێیدا بمرم، ئەجەل بەردەوام بەدەورمدا دێت و ئاگادارمئەکاتەوە، نازانم کەی رامئەگرێت و پێمئەڵێت: بوەستە! کاتی دەورو تەسلیمە، رۆحێکمان پێدای بۆئەوەی جوان و خۆش پێی بژیت ئێستا کاتی وەرگرتنەوەی هاتووە، فەرموو بماندەوە! کەچی من کە غەفڵەت و بێئاگایی کورتاومی تازەبەتازە سەرئەکەمە دونیاو خەریکی بەزمی دنیاو دەورانم! سبەینێ هەموو ئەمرین و حەشرئەکرێین، براینە فرسەتە ئەکرێ هەموو کەس فریای خۆی بکەوێت و کەس دەسخەرەی کەسی تر نەبێت، ئێوە لەمنێکی گوناهبار دووربکەونەوە با لەگەڵ من حەشرنەکرێن و گیرۆدەبن، من نازانم نەفسی بەدم لەمە زیاتر چی لێمئەوێ؟ کە هەم رەوشتی بەدو خراپکردووم و هەم هەڵسوکەوتی بەدکردووم و هەم بیروبیرکردنەوەو گشت قۆناغەکانی ژیانمی خراپ و بەدکردووە.. مەگەر ئەو پەروەردگارە بەسۆزە بمخاتە بەر لافاوی لێبووردنی خۆی و

بمبەخشێت، ئەگەرنا ئەوە بەراستی زەحمەتە لەم گوناهانەم پاکببمەوەو شایان بەوە بم پەردەم پێدا بدرێت و بشارێمەوە..

٣-ئەبێت ئافرەتی موسڵمان گاڵتەی خەڵکی ئەوەندە بەهەند وەرنەگرێت، ئەبێت بزانێت ئەو خەڵکانەی کە گاڵتە بەحیجابەکەی ئەکەن نەبۆ دونیاو نەبۆ ئاخیرەت کەڵکی ناگرن، هەندێ لەو خەڵکانە مەبەستی ناشەریفانەیان هەیە لەبێحیجابکردنی ئەم، ئەبێت ئەوە بێنێتە بیری خۆی کە ئەوانەی گاڵتەیان پێئەکرێت لەسەر حیجاب و بالاپۆشی ناهەقیان پێئەکرێت، حیجاب ئەگەر بەسوودیش نەبێت ئەوا بەدڵنیاییەوە هیچ زیانێك بەخەڵکی ناگەیەنێت.

عەیبە مرۆڤ ئەوەندەش لەقسەی خەڵکی بترسێت، بەتایبەتی کاتێك ئەو جۆرە خەڵکانە کەسانی بەتاڵ بن، یان ناحەز بن، یان کەسانی نەفسپیس و خراپ بن، یان کەسانی دەروون نەخۆش یان لاوازو بێ ئیرادەبن.

ئایا ڕاست ئەوەیە تۆ لەقسەی خوا بترسی یان لەقسەی خەڵکی، ئایا لەچارەنووسی خۆت بترسی یان لەئێستاو

ڕابـردووت بترسـی، کامیـان ڕاسـتە ئـەو کەسـەی خـۆی بڕیاربدات یان ئەو کەسەی خەڵکی بڕیاری بۆ بدەن؟!!

٤-ئەبێت ئەو کەسەی کە حیجابی لاقورسە ئەوە بزانێت کە دین ئەرکێکی قورسە، بەلآم بەسوودە بۆ دونیـاو ئاخیرەت، ڕاستە دین و ئەرکە دینیـەکان لای نـەفس گـرانن، پابەنـدبوون پێیانـەوە هەنـدێك جار وەك هـەڵگرتنی پشـکۆیەکی ئـاگرە، بەلآم دەرئەنجامی ئەو ئارامگرتنـە دەستکەوتنی ڕەزامەنـدی خواو بەهەشتی بەرینە..

پێغەمبـەر(صـلی اللهعلیەوالەوسـلم)ئەفـەرموێ:«یَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ الصَّابِرُ فِيهِمْ عَلَى دِينِهِ كَالقَابِضِ عَلَى الجَمْرِ»[٢٧]، یـانی زەمانێـك دێـت بەسـەر خەڵکیـدا ئـەوەی ئارامبگرێـت لەسـەر دینەکـەی وەك ئەوەوایـە کـە پشـکۆیەکی ئـاگری گرتبێـت بەدەسـتەوە، مرۆڤـی موسـڵمان چ ڕێگەیـەکی لەبەردەسـتایە لـەو ڕۆژەدا: ئەگەر دین فڕێئەدات ئەوە بێدین ئەبێت و ڕەنجەڕۆی دونیـاو ئـاخیرەت ئـەبێ، ئەگـەر ئـارامیش ئـەگرێت ئـەوە ئێسـك و

٣٧ سنن ابي داود، ابي داود،رقم الحديث:٢٢٦٠.

پرۆسـەکی ئەسـووتێنێت، بـەلام بـۆ قیامـەتی ئـەبێ هـەر ئارامبگرێت، چارێکی تری نیە.

ئـەزانن ئەوانـەی کـە واز لەحـەزێکی کـاتی ئـەهێنن و بەرۆژووئـەبن چـەندە لای خـوا خۆشەویسـتن و خـوای پـەروەردگاریش چ پاداشـتێکی بـۆ ئامـادەکردوون؟!

پێغەمبـەر(صـلی اللەعلیەوالەوسـلم) ئەفـەرموێ:«كُلُّ حَسَنَةٍ يَعْمَلُهَا ابْنُ آدَمَ تُضَاعَفُ عَشْرًا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ غَيْرَ الصِّيَامِ هُوَ لِي، وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، يَدَعُ شَهْوَتَهُ مِنْ أَجْلِي، وَيَدَعُ طَعَامَهُ مِنْ أَجْلِي»[٣٨]

یانی: هەموو چاکەیەك کە نەوەی ئادەم ئەیکات چەندقات ئەکرێتەوە بۆی تا ئەگاتە حەوت سەد قات، رۆژوو نەبێت کە ئەوە ساغ بۆمنە، منیش ئەزانم چۆن پاداشتی بدەمەوە، رۆژووەوان دەستبەرداری حەزەکانی ئەبێت لەبەرخاتری من، دەستبەرداری خواردنەکانی ئەبێت لەبەر من!

نەخۆشێك لەپێناوی ئەوەی لەشساغ بێت، بەگوێی دکتۆر ئـەکات و ئـەو هـەموو دەرمانـە تاڵـەش ئـەخوات، چـونکە ئەزانێت ئەو پێڕەویکردنە لەرێنماییەکانی دکتۆر لەشساغی

[٣٨] مصنف عبدالرزاق الصنعاني، رقم الحديث:٧٨٩٣.

و بەردەوامبوونی ژیانی ئەوی پێوەبەندە، ئەوە بێ عەقڵی نیە تۆ سوێری نەخۆیت لەبەر ئەوەی فشاری خوێنت هەیە، یان شیرینی نەخۆیت لەبەر ئەوەی بۆ شەکرەکەت خراپە، یان لەچەوری خۆت بپارێزیت لەبەر ئەوەی کە کێشت زیادنەبێت، هەموو ئەوخۆگرتنانەوە لەخۆشیەکی کاتی-کەلای کەسی منالّ یان ناعاقڵ زۆر زەحمەتە- بۆ ئەوەیە کە تۆ خۆشیەکی هەمیشەییت دەستبکەوێت کەئەویش ژیان بردنەسەرە بەلەشێکی ساغ و سەلامەت و دوور لەنەخۆشییەوە .. ئەمە بێ عەقڵی نیە خۆت لەو خۆشی و چێژە کاتیانە بگریتەوە، بەڵکو ئەوە بێعەقڵیە کە لەپێناو خۆشیەکی کاتیدا جڵەو بۆ نەفست شلبکەیت و بیرت لای داهاتووت نەبێت، تا نەخۆشی ئەداتە خوێن و لەش و دڵ و هەناوت، ئەوکاتە کە پەشیمانبوونەوە دادت نادات و دەیان پارێزیش بکەیت ناتباتەوە دۆخی جارانت و ئەبێ هەموو تەمەنت بەئازارو ترسەوە بەسەربەریت..

بۆیە لەراستیدا ئەوە بێعەقڵی نیە پارێز لەگوناه بکەیت و وەك خەڵکی هەوەسپەرست سەرنەکەیتە گوناه، ئەوە کەم عەقڵی نیە حیجاب بکەیت و خۆت لەهەندێ خۆشی کاتی-

کـەزۆرجار خۆشـی وەهەمـین نـەك ڕاسـتەقینە- بگریتـەوە بەئومێدی ئەوەی لەقیامەتدا بەجەستەیەکی ساغ و ڕۆحێکی پاکەوە لەبەهەشتدا پەرواز بکەیت ..

خـوای گـەورە ئەفـەرموێت ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ (١٧) الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُولَئِكَ هُمْ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾، مژدە بدە بەو عەبدانەی کە زۆر لەخۆیان ئەکەن و گوێدەگرن بۆ قسەو پاشان شوێن باشترین قسە ئەکەون، ئائەوانە کەسانێکی ڕاستگۆن و هەر ئەوانە خاوەن عەقڵ و گەوهەردارن..

کەواتە کەسی عاقڵ و گەوهەردار ئەو کەسەیە کە :

١-زۆر لەخۆی ئەکات و گوێ بۆ قسە ئەگرێت .

٢-ئـەو قسـانە هەڵئەسـەنگێنێت و چـاکیان لـەخراپ جیائەکاتەوە.

٣-شوێن قسە چاکەکان ئەکەوێت و خۆشی بەدور ئەگرێت لەخراپەکان.

٤-لەناو قسە چاکەکانیشدا، پێڕەو لەچاکترینیان ئەکات و ئەوانەیان ئەکاتە بەرنامە بۆ ئێستاو داهاتووی خۆی.

**پێغەمبەر(صلی اللەعلیەوالەوسلم)ئەفەرموێ:** " عُرض عليّ أول ثلاثة يدخلون الجنة :شهيد وعفيف مستعفف، وعبد أحسن عبادة الله"[39] **یانی: ئەو سێ کەسەم پیشاندرا کە یەکەمین کەسن ئەچنە بەهەشت: شەهیدو پاکداوێن و عەبدێك کە بەجوانی عیبادەتی خوای خۆی ئەکات.**

**خوای گەورە لەحەدیسێکی قودسیدا ئەفەرموێت:** "عبدي أطعتنا فقربناك، وعصيتنا فأمهلناك، ولوعدت الينا بعد ذلك قبلناك، أني والأنس والجن في نبأ عظيم، أخلق ويعبد غيري، وارزق ويشكر سواي، خير الى العباد نازل وشرهم الي صاعد، أتحبب اليهم بنعمتي وأنا الغني عنهم، ويتبغضون الي بالمعاصي وهم أفقر شيء الي، من بعد منهم ناديته من بعيد، ومن قرب منهم ناجيته من قريب، أهل ذكري أهل عيادتي، أهل شكري أهل زيادتي أهل طاعتي أهل محبتي، أهل معصيتي لا اقنطهم من رحمتي، أن تابوا الي فأنا أحبهم، أحب التوابين وأحب المتطهرين، وان لم يتوبوا فأنا طبيبهم، ابتليهم بالمصائب، لأطهرهم من الذنوب والمعايب، الحسنة عندي بعشر امثالها او ازيد والسيئة عندي بمثلها او اعفو، وانا أرحم بعبادي من الام بولودها""[40].

---

[39] **سنن الترمذي، الترميذي، وسنده حسن.**

[40] **إبن تيميه لە (منهاج السنه): (٢١٠/٥) بەشێك لە ئەم (أثر)ە باس ئەکات.**

واتە: ئەی عەبدەکەم! تا گوێڕایەڵیت ئەکردین لەخۆمانمان نزیکئەکردیتەوە، کە دەستتدایە گوناهکردنیش مۆڵەتمان پێدایو لێتگەڕاین، ئەگەر دوای ئەو گوناهانەش بگەڕێیتەوە بۆ لامان هەر قەبووڵت ئەکەین، منو مرۆڤو پەری لەناو دەنگوباسێکی گەورەداین، من ئەیانخولقێنم کەچی ئەوان عەبدایەتی جگە لە من ئەکەن، من رزقیانئەدەم کەچی ئەوان سوپاسی جگە لەمن ئەکەن! خێروبێرم بۆ عەبدەکانم دێتەخوارەوە کەچی ئەوان شەڕو خراپەیان بۆمن دێتەسەرەوە، خۆمیان لاخۆشەویستئەکەم بەو هەمووە رۆزیەی پێیانئەدەم، لەکاتێکدا من هیچ پێویستیشم بەوان نییە، کەچی ئەوان من زویرئەکەن لەخۆیان بەو هەمووە گوناهەی ئەیکەن، لەکاتێکدا ئەوان پێویستی زۆریان بەمن هەیە، هەرکەسێکیان دووربکەوێتەوە لەدوورەوە بانگیلێئەکەم، هەرکامیشیان نزیکبکەوێتەوە لەنزیکەوە موناجاتی ئەکەم، ئەوانەی سەرقاڵی یادکردنی منن شایەنی ئەوەن لەمەجلیسی منداین، ئەوانەی سوپاسی من دەکەن شایەنی ئەوەن زیاتر بڕژم بەسەریاندا، ئەوانەی عیبادەتی من ئەکەن شایەنی ئەوەن خۆشەویستی من بن، ئەوانەی

بێگوێی من دەکەن بێهیوایان ناکەم لەرەحمەت و سۆزی خۆم، ئەگەر (لە کۆتاییدا) گەڕانەوە ئەوە خۆشمئەوێن، کەسی تۆبەکارو پاکم خۆشئەوێت، ئەگەر تۆبەش نەکەن ئەوە من ئەبم بەدکتۆریان، توشی لێقەومان و موسیبەتیان ئەکەم تا پاکئەبنەوە لەشوورەیی و گوناهەکانیان، چاکە لای من دەئەوەندەی خۆی پاداشتی هەیە یان زیاتریشیان ئەدەمێ، خراپەش لای من هەر یەك پاداشتی هەی یان لێشیان ئەبوورم، (بەدڵنیاییەوە) من بەرانبەر عەبدەکانم بەمیهرو بەرەحمترم لە دایکێك بەرانبەر بە منداڵەکەی"!!.

جا هەرکەس پەروەردگارێکی ئەوەندە بسۆزی هەبێت، شوورەیی نیە گوێی بۆنەگرێت، ماڵوێرانی نیە بەگوێی فەرمانەکانی نەکات؟ نەگبەتی نیە کە لە ئەم ساتە بەدواوە بڕیارنەدات گوێگرو گوێڕایەڵی ئەو پەروەردگارە بێت.

لەبەر ئەوەی خۆداپۆشین و حیجابکردن لای هەندێك کارێکی قورسەو ئاسان نیە ئەو بڕیارە بەیەکجار بدات، من حەز ئەکەم ئەو جۆرە کەسانە هەندێ وردتر ئەم سێ بڕگەیە

بخوێننەوەو زیاتر لێیوردببنەوە، بەڵكو زووتر بگەنە ئەو بڕیارە:

بڕگەی یەكەم:

هەندێ قەناعەتی فیكری بۆ خوشكی موسڵمانی بێ حیجاب

خوشكی واهەیە كەپێیئەڵێی: بۆچی حیجاب ناكەیت؟ ئەڵێ: قەناعەتم بەوە نیە حیجاب فەرزبێت و خوا لەسەر حیجاب نەكردن عەبدێكی خۆی بخاتە ئاگر !!

ئێمە سێ پرسیار لەم خوشكە بەڕێزە ئەكەین:

١. ئایا بڕوات بەئیسلام هەیە ؟

٢. ئایا بڕوات وایە كەحیجاب بڕگەیەكە لەناو شەریعەتی ئیسلامدا ؟

٣. ئایا ئەوەی حیجاب ئەكات یەكسانە بەوەی كە گوێ بەحیجاب نادات ؟

بێگومانم كە ئەم سێ پرسیارە لەهەر ئافرەتێكی نوێژگەری بێحیجاب بكەی ڕاستەوخۆ و بێ دوودڵی ئەڵێ: استغفرالله! ئەی چۆن! مامۆستا من خۆم موسڵمانم و باوك و دایكم موسڵمانن و لەبنەماڵەیەكی موسڵمانین: ( اشهد ان لا اله الا الله، واشهد ان محمد رسول الله )...

ئێمــەش ئەپرسـین: دەی دادە باشــەکە! کـەتۆ بـڕوات وایــە ئیســلام راســتەو ئــەم حیجابــەش فەرزێکــە لەشــەریعەتی ئیسلامداو بڕواشتوایە کە راست نیە ئەوەی حیجاب بکات و مووبــەموو لەگــەڵ شــەرعدا بــڕوات یەکســانبکرێت بــەوەی حیجاب ناکات، دەی کەواتـە بۆچـی تۆش حیجاب ناکـەیت؟ بۆچی خۆت ناگەیەنیتەوە بەکاروانی خۆشەویستانی خوادا؟ لـەوەش دڵنیـام کـە هەنـدێ لـەو ئافرەتانـە ئـەڵێن: دەی خـۆ شــوکور ئێمــەش موســڵمانین و بڕوامــان بــەخواو پێغەمبــەر هەیــەو شــایەتی بەراسـتی بۆخـواو بـۆ پێغەمبــەر ئــەدەین و دڵیش شەرتە نەك رووکەش!

بۆ ئـەم جۆرە ئافەتانـە پێویسـتە روونکردنەوەی زۆر بـدەین و بۆنمونـە لێیـان بپرسـین: ئایـا تـۆ ئـەزانی(لا الـه الا الله)و (محمــد رســول الله) یــانی چــی؟ ئایــا ئــەزانی ئــەم شــایەتیدانە بۆخـواو پێغەمبـەر(صـلى اللهعليهوالهوسـلم)، چ ئــەرکێك ئەخەنەسەشــانی موســڵمان؟ ئایــا ئــەزانی ئــەم شــایەتیدانە چ کاتێـك لـەمرۆڤی موسـڵمان وەردەگیرێـت و چ کاتێك ئەدرێتەوە بەسەریدا؟

ئەگەر ئەوەی نەزانی، ئەوە پێویستە لەسنوری ئەم خالانەدا ئەو مەسەلەیەی بۆ ڕۆشنبکرێتەوە:

دروشمی پیرۆزی"لااله الا الله...محمد رسول الله"هەروا وشەیەك نیەو بەدەم بووترێت و ئیتر هیچ ئەرکێك نەخاتەسەرشانی خاوەنی ئەو قسەیە، ڕاستە ئەو دروشمە پیرۆزە کارتی چوونە بەهەشتە، بەلام بەو مەرجەی بڕوای پێ هەبێت و کاری پێبکات، ئەوکەسە ڕزگاریئەبێت لەقیامەتدا ئەگەر مەرجەکانی ڕەچاوبکات و خۆی بەدووربگرێت لەو شتانەی کە ئەو شایەتیەی بۆخواو پێغەمبەر هەڵدەوەشێنێتەوە[41]، وەك خوای گەورە بەروونی و لەئایەتی موحکەمدا ئەفەرموێ:( إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا (٤٨)..دڵنیابن خوا لەوکەسە خۆشنابێت کە هاوەڵی بۆپەیدائەکات، لەهەموو ئەوگوناهانە ئەبورێت کە لەخوار شیرکەوەن ئەگەر

[41] بەرەحمەت بێت سەید قوتب لەساڵی پەنجاکاندا وتارێکی بەو ناونیشانە نوسی"لااله الا الله منهج حياه" کە تێیدا ئەیسەلمێنێت لەڕاستیدا بەرنامەی گرووپی ڕزگاربوو بریتیە لە"لااله الا الله...محمد رسول الله".

ویستی، هەرکەس هاوەڵ بۆخوا پەیدابکات ئەوە لەراستیدا بوختانێکی گەورەی کردووە..

هەموو موسڵمانێك پێویستە لەم مەسەلەیەدا چوار برگە بزانێت:

یەکەم: ئەو مەرجانەی شایەتیەکەت بۆخوا قەبوڵئەکەن.

دووەم: ئەو شتانەی شایەتیەکەت بۆخوا هەڵئەوەشێننەوە.

سێیەم: ئەو مەرجانەی شایەتیەکەت بۆ پێغەمبەری خوا قەبوڵئەکەن.

چوارەم: ئەو شتانەی شایەتیەکەت بۆ پێغەمبەری خوا هەڵئەوشێننەوە.

یەکەم:

ئەو مەرجانەی شایەتیەکەت بۆخوا قەبوڵئەکەن.

لەراستیدا ئەو حەدیسانەی دەربارەی "لاإلە إلا الله" هاتوون ئەگەر هەموویان کۆبکەیتەوە ئەبینی کەچەند مەرجێك بۆ وتنی ئەو"لااله الا لله"یە دائەنێن، کەبەکورتی

**مەرجەکانی"لااله الاالله"[٤٢] هەشتن: عیلم و ئیخلاص وقەبول ویەقین و مەحەبەت و صیدق و ئینقیادو بەرائەتە لەشیرك و لەموشـــریکین.. ئـــەتوانین بـــەم شـــەش بەیتـــە شـــیعرە کۆیانبکەینەوە..**

**(علم)و (إخلاص)و (قەبول)و (یەقیـــن)**
**(مەحبەت)و (صیدق)، (ملدانە بۆ دین)**
**(بەرائەت لە شیرك لە هەڵگـــرانی)**
**ئەمانە هەشتن ئەبێ بیزانـــــی**
**چـــورن لەدونیادا مایەی حورمەتن**
**بۆ قیـــامەتیش کارتـــی بەهەشتن**

**یەکـەمیان عیلمـەو دژەکـەی جەهلـە: یـانی ئـەبێ خـوا وەك پێویســـت بناســێت، چـــونکە پێغەمبـــەر(صـــلی الله**

[٤٢] لەراستیدا ئەو بابەتە پێویستە لەژێر ناوی (مەرجەکانی لااله الا الله محمد رسـول الله)دا شـرۆڤە بکرێـت نـەك تـەنیا لـەژێر (مەرجـەکانی لاالـە الا الله)دا باسـبکرێن وەك زۆربـەی کتێبەکانی عەقیدە لەم رۆژگارەدا باسیانئەکەن، چونکە ئـەو رستەیە (لاالـە الا الله محمـد رسول الله) چوار لقی سـەرەکی لێئەبێتـەوە: ١- مەرجـەکانی قـەبوڵبوونی لاالـە الا الله..٢- مەرجـەکانی هەڵوەشـاندنەوەی لاالـە الا الله، ٣- مەرجـەکانی قـەبوڵبوونی محمـد رسـول الله..٤- مەرجەکانی هەڵوەشاندنەی محمد رسول الله..

علیەوالەوسلم) ئەفەرمویٚ:(من مات وهو یعلم الا إله إلا الله دخل الجنه)، رواه النسائی.
هەرکەس مردو ئەیزانی(لاالەالاالله)یانی چی ئەوە ئەچیٚتە بەهەشت..
دووەمیان ئیخلاصەو دژەکەی شیرکە: یانی خۆی بەدووربگریٚت لەشیرك و بۆخواش دڵسۆزبیٚت، چونکە پیٚغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم)ئەفەرمویٚ:(أسعد الناس بشفاعتي یوم القیامة من قال لا إله إلا الله یبتغي بذلك وجه الله)، رواه البخاري.. دڵخۆشترین کەس بەتکای من لای خوا لەقیامەتدا ئەوکەسەیە بەدڵ وتبیٚتی (لااله الاالله).
سیٚیەمیان قەبوڵکردن وشویٚنکەوتنی ئەوەیە پیٚغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم)هیٚناویەتی و دژەکەی قەبوڵنەکردنی ئەو پەیامەیە: چونکە پیٚغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم)ئەفەرمویٚ:( لا یؤمن أحدکم حتی یکون هواه تبعًا لما جئت به)، ئیمانی هیچ کامیٚکتان تەواو نابیٚت تا شویٚن ئەوە نەکەویٚت کەمن هیٚناومە لای پەروەردگارەوە.
چوارەمیان یەقینەو دژەکەی شك و گومانە: چونکە پیٚغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم) ئەفەرمویٚ:(أشهد ألا إله إلا

الله وأشهد أني رسول الله لا يلقى الله بهما عبد غير شاك فيهما فيحجب عن الجنة)، **یانی: شایەتیدان بۆ تاك و تەنیایی خواو شایەتیدان بۆ پەیامبەری موخەممەد هەرکەس بەدەستیەوە بێت بۆ قیامەت و گومانی لێی نەبێت، رێگەی بەهەشتی لێناگیرێت.**

**پێنجەمیان مەحەببەتەو دژەکەی بێمەحەببەتی و خۆشی لێنەهاتنە: پێغەمبەر(صلی الله علیەوالەو سلم) ئەفەرموێ:(لا یؤمن أحدکم حتی أکون أحب إلیه من ولده ووالده والناس أجمعین) متفق علیة. هەیچ کەسێك لەئێوە ئیمانی تەواونابێت تا منی لەخۆی و منالْ و دایك و باوك و گشت خەلْکی خۆشتر نەوێت.**

**شەشەمیان بەراستی بێت کە ئەلْێ(اشهد ان لااله الاالله واشهد ان محمدا رسول الله): پێغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم) ئەفەرموێ:**(من قال لا إله إلا الله صدقًا من قلبه حرمه الله علی النار) . **هەرکەس بەراستی و لەدلْەوە بلْێ: لاالەالاالله ئەوە خوا جەستەی حەرامئەکات لەئاگری دۆزەخ.**

**حەوتەمیان ملدانە بۆ"لاالە الاالله"و دژەکەی ملنەدان و تەسلیمنەبوونە پێی: خوای گەورە ئەفەرموێ:**(إنهم كانوا إذا قيل

لهم لا إلـه إلا الله يسـتكبرون ويقولـون أإنـا لتـاركوا آلهتنـا لشـاعرٍ مجنـون). ئەوانــە بۆیــە ئەخرێنــە ئــاگر چــونکە کاتێــك پێیانئەوترا(هەر خوا بەتەنیا شایستەیە گوێی بۆبگیرێت و گوێڕایەڵی بکرێت) لووتیان ئەکرد بەئاسماندا.

هەشتەمیان بەرائەت لەکوفرو شیرك کە دژەکەی دۆستبوون و تێکەڵبوونــە بــەکوفرو شــیرك، خــوا ئەفــەرموێ:(فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى لاانفصام لها والله سميع عليم)،هەرکەس کافرببێت بەشەیتان و بڕوابهێنێت بەخوا ئەوە دەستی بەقوڵفی رزگاریەوە گرتووەو لێیجیانابێتەوە..

دووەم:

ئەو شتانەی شایەتیەکەت بۆخوا هەڵئەوەشێننەوە.

وەك لازم و مەلزوم بۆ یەکتری ئەو مەرجانە ئەگەر هەبوون ئەوە رزگاربوون ئەبێت و ئەگەر نەبوون یان دژەکانی هەبوون ئــەوە رزگــاربوون نیــە لــەعادزی خــواو ســزای خــواو شایەتیدانەکە هەڵئەوەشێتەوە، یانی:

هەرکەسێك نەزانێت خوا تاك و تەنیایەو هەرئەو شایستەی گوێگرتن و گوێڕایەڵیە.

یان کە وتی خوا تاك و تەنیایە پاك نەبوو لەو قسەیداو مەبەستی تری هەبوو..

یان قەبوڵی نەبوو کە خوا بەتاك و تەنیا ناوببرێت..

یان بەگومان بوو لەوەی کە خوا تاك و تەنیایە..

یان خۆشی لەوە نەئەهات کە خوا تاك و تەنیا بێت..

یان بەراستی نەبوو کە ئەڵێ خوا تاك و تەنیایە..

یان ملی نەئەدا بۆ خواو دینی خوا لەگەڵ ئەوەدا کە ئەڵێ: خوا تاك و تەنیایە..

یان خۆی بەدوورنەئەگرت لەشیرك و لەهەڵگرانی شیرك و خۆشیی لەتێکەلاویان ئەهات و پێیان رازیبوو..

ئەو کەسەی وابێت ئەوە ساڵ دوازدە مانگەو شەوو رۆژ بیست و چوار سەعاتە"لا إله إلا الله"بکات سوودی بۆی نیەو گاڵتە بەخۆی و بە ئەو رستە پیرۆزەش ئەکات و نابێ چاوەڕوانی رزگاربوون بکات لەئاگر بەو وتنە.. رەحمەت لە مەحوی کە ئەڵێ:

لەدڵدا خەڵك و خوا بوو فائیدەی چی

کە دەم پڕبێت لە"ایاك......ایاك"!!

**سێیەم:**

**ئەو مەرجانەی شایەتیەکەت بۆ پێغەمبەری خوا قەبوڵئەکەن.**

**کەبەکورتی بریتیە لەم حەوت خاڵە سەرەکییە:**

**١-موحەممەد کۆتا پێغەمبەری خوایەو کۆتا پەیامی ئەویشی هێناوە بۆ رزگاری ئەم مرۆڤایەتیە. خوای گەورە ئەفەرموێ:**(مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ).. **پێغەمبەر خۆشی (ﷺ)ئەفەرموێ:**"ان مثلي ومثل الانبياء من قبلي كمثل رجل بنى بيتاً فأحسنه وأجمله الا موضع لبنة من زاوية فجعل الناس يطوفون به ويعجبون له ويقولون هلا وضعت هذه اللبنة ، فأنا اللبنة وأنا خاتم النبيين".[٤٣]

**٢-ئەبێ پێغەمبەرمان(صلى الله عليەوالەوسلم) لەخۆمان و لەهەموو کەسێکی تر خۆشتربوێ و لەنێوان خۆشەویستی ئەوو جگە لەئەودا تەنیا خۆشەویستی ئەو هەڵبژێرین.ئەنەس ئەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله**

[٤٣] رواه البخاري، كتاب المناقب، باب ختم النبيين.

**علیەوالەوسلم)ئەفەرموێ**:(لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ).٤٤

**٣-شوێنکەوتنی پێغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم) واجبە هەم لەعەقیدەداو هەم لەعیبادەتدا و هەم لەتەفسیری دینْدا: خوای گەورە ئەفەرموێ**:(فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا).

**تەفسیرزانی گەورە ئیبن کەسیر لە تەفسیری ئایەتی**(قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٣١) قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ (٣٢) }**دا ئەفەرموێ**:( هذه الآية الكريمة حاكمة على كل من ادعى محبة الله، وليس هو على الطريقة المحمدية فإنه كاذب في دعواه في نفس الأمر، حتى يتبع الشرع المحمدي والدين النبوي في جميع أقواله وأحواله..)..**ئەم ئایەتە پیرۆزە حوکمئەدات بەسەر هەموو ئەو کەسانەدا کەلافی خۆشەویستی خوا لێئەدەن کەچی لەسەر رێبازەکەی موحەممەد ناڕۆن، ئایەتەکە حوکم ئەدات بەسەر ئەوکەسانەدا کە لەراستیدا درۆزنن و راستناکەن تاشوێن**

[44] أخرجه البخاري في: ٢ كتاب الإيمان: ٨ باب حب الرسول صلى الله عليه وسلم من الإيمان.

**شەرعی موحەممەد نەکەون و دینی پێغەمبەر نەکەنە پێوەر بۆ هەموو قسەو هەڵوێستیکیان... هەروەها بیریارو زانای گەورە ئیبنولقەییم لەکتێبی:«زاد المعاد في هدى خير العباد »دا ئەفەرموێ:**«ومن تأمل في السير والأخبار الثابتة من شهادة كثير من أهل الكتاب والمشركين له -صلى الله عليه وسلم- بالرسالة وأنه صادق، فلم تدخلهم هذه الشهادة في الإسلام . . علم أن الإسلام أمر وراء ذلك، وأنه ليس مجرد المعرفة فقط. ولا المعرفة والإقرار فقط. بل المعرفة والإقرار والانقياد والتزام طاعته ودينه ظاهراً وباطناً . . »**٤٥**

**٤-ئەبێ دیفاع لەپێغەمبەرو فەرموودەو سووننەتەکانی بکەی و بەرزڕاییگری و خۆت و ئەوەی هەتە بیکەیتە قەڵغان بۆی لەبەردەم قسەو ڕەفتاری ناشایستەی دوژمنەکانیدا، خوای گەورە ئەفەرموێ:**(لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ (١٢٨) فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ)،**پێغەمبەری خوا (صلى الله عليەوالەوسلم)لەعەقەبەدا کە عەبباسی مامەی باسی ئەوەی کرد کەپێغەمبەر(صلى الله**

---

[45] **بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە تەفسیری ئایەتی:(قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ)لە تەفسیری"في ظلال القرآن"ی سەید قوتب و تەفسیری"ئیبن کەسیر"..**

علیەوالەوسلم)ئەیەوێ بچێت بۆناویان، موسڵمانە مەدینەییەکان وتیان:( فتكلم يا رسول الله! فخذ لن لك ولربك ما أحببت)، لەریوایەتێکی تردا ئەڵێ: وتیان:(خذ لنفسك ما شئت واشترط لربك ما شئت)، پێغەمبەریش فەرمووی:( أشترط لربي عز وجل أن تعبدوه ولا تشركوا به شيئا ولنفسي أن تمنعوني مما تمنعون منه أنفسكم وأبناءكم ونساءكم)،ئیبن رەواحە هەستایەوەو وتی:( فإذا فعلنا فما لنا)؟ پێغەمبەر (صلى الله علیەوالەوسلم)فەرمووی:(لكم الجنة)،وتیان: (ربح البيع لا نقيل ولا نستقيل)..[46]،مامەڵەیەکی پڕقازانجە! نەدەستی لێئەکێشینەوەو نە داوای دەست لەکارکێشانەوەش ئەکەین.

٥-ئەبێ پێغەمبەر(صلى الله علیەوالەوسلم)بەمەعصوم بزانی بەتایبەتی لەگەیاندنی پەیامی خوادا، خوای گەورە ئەفەرموێ:(وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى (٢) وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤)...هەروەها ئەفەرموێ(لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِنْ أَنْفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ

[46] السيرة الحلبية، علي الحلبي،(٢/١٧٥).

لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ). **پێغەمبەر(صلى الله عليەوالەوسلم) لەحەجی ماڵئاواییدا بە هەموو ئەو صەحابانەی فەرموو کە هاتبوون بۆ حەجی ئەوساڵە:**( أيها الناس لعلي لا ألقاكم بعد عامي هذا، وإنكم ستُسألون عني، فما أنتم قائلون)، **هەموو وەلآمیاندایەوەو وتیان:**( نشهد أنك قد بلغت الرسالة وأديت الأمانة ونصحت الأمة..)، **پێغەمبەریش(صلى الله عليەوالەوسلم)دەستی موبارەکی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی:**(اللهم فاشهد، اللهم فاشهد)[47]. **صەحابەی بەڕێزی پێغەمبەر (صلى الله عليەوالەوسلم) ئەفەرموون:**" لقد تركنا محمد – صلى الله عليه وسلم – وما يحرك طائر جناحيه في السماء إلا ذكر لنا منه علماً[48]. **یان ئەفەرموون:** "قام فينا رسول الله مقاماً فأخبرنا عن بدء الخلق حتى دخل أهل الجنة منازلهم، وأهل النار منازلهم، حفظ ذلك من حفظه ونسيه من

---

٤٧الأيام النظرة والسيرة العطرة لرسولنا صلى الله عليه وسلم، الشيخ : صالح بن عواد المغامسي.(٤٤/١).

٤٨الإمام أحمد في مسنده: ١٥٣/٥.

نسیه"[49]، **ئیمامی شافعیش ئەفەرموێ**:"فلیست تنزل بأحد من أهل دين الله نازلة إلا وفي كتاب الله الدليل على سبيل الهدى فيها"[50].

**٦-پێغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم) کاملترین کەسە لەدونیاداو شوێنکەوتنی ئەو مایەی جوانی و سەربەرزیە، خوای گەورە ئەفەرموێ:**( لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ).

**٧-ئەبێ بەرێزەوە بۆی بڕوانین و چاویلێبکەین و ئیقتیدای پێوەبکەین و بڕوامان وابێت کە وەك چۆن لەژیانی دینداریدا کەسێکی کامڵ بووە هەرواش لە ژیانی دنیاییدا کەسێکی کامڵ بووە(صلی الله علیەوالەوسلم)، لەراستیشدا هیچ کەسێك ناتوانێت بگاتە ئەو پەڕی (ئیقتیدا) بە پێغەمبەری خواوە(صلی الله علیەوالەوسلم) تاوەکو چاو لە پێغەمبەری خوا نەکات لە هەموو شتێکدا.**

**شێخ ئەلبانی-بەرەحمەت بێت-لە کتێبی**(الحديث حجة بنفسه في العقائد:ص٩٨)**دا جوان ئەڵێت**:(...فكما أنكم توحدون الله تعالى

---

[49] صحيح البخاري، كتاب بدء الخلق، باب ما جاء في قوله تعالى: { وهو الذي يبدء الخلق ثم يعيده } ج٤ ص٧٣.

[50] الرسالة، الشافعي: ص ٢٠.

في عبادتكم فكذلك تفردون رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم في اتباعكم فمعبودكم واحد ومتبوعكم واحد و بذلك تحققون عمليا شهادة أن (لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله).

فوطنوا أيها الأخوة الكرام أنفسكم على: أن تؤمنوا بكل حديث ثبت لديكم عن رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم سواء كان في العقيدة أو الأحكام و سواء قال به إمامك الذي نشأت على مذهبه بحكم بيئتك أو غيره من أئمة المسلمين، و لا تتبنوا قاعدة من تلك القواعد التي وضعت بآراء بعض الرجال و اجتهاداتهم وهم غير مجتهدين فيصدكم ذلك عن الاتباع. و لا تقلدوا بشرا مهما علا أو سما، تؤثرون قوله على قول رسول الله صلى الله عليه وآله وسلم بعد أن بلغتموه.

و اعلموا أنكم بذلك فقط لا بغيره تحققون علما وعملا المبدأ القائل: "لا إله إلا الله منهج الحياة" و"الحاكمية لله وحده تبارك وتعالى" وبدون ذلك يستحيل أن نوحد"الجيل القرآني الفريد" الذي-هو وحده- يستطيع أن ينشئ "المجتمع المسلم وخصائصه"[51] وبالتالي الدولة المسلمة المنشودة، مصداقا للحكمة الصادقة التي قالها أحد الدعاة الإسلاميين الكبار رحمه

---

[51] ئەو رستانەی لەناو کەوانەکاندان هەموو ناونیشانی ئەو وتارو کتێبانەن کە سەید قوتب لەژیانیدا نووسیوونی، رستەی" اقیموا دولة الاسلام في قلوبكم تقم على ارضكم"یش قسەی حەسەن هوزەیبییە -رەحمەتی خوا لەهەموان بێت-.

الله تعالى: "أقيموا دولة الإسلام في قلوبكم تقم لكم على أرضكم"، وعسى أن يكون ذلك قريبا.

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ}..

**چوارەم:**

**ئەو شتانەی شایەتیەکەت بۆ پێغەمبەری خوا هەڵئەوشێننەوە**

**جا کەواتە ئەگەر:**

**١-موحەممەد بەکۆتا پێغەمبەری خوا نەزانێت و ئیسلام بەکۆتا پەیامی خوا نەزانێت کە ئەو هێناویەتی بۆ رزگاری ئەم مرۆڤایەتیە، یان**

**٢- پێغەمبەری(صلى الله عليه واله وسلم) لەخۆی و لەهەموو کەسێکی تر خۆشترنەئەویست و لەنێوان خۆشەویستی ئەوو جگە لەئەودا تەنیا خۆشەویستی ئەوی هەڵنەبژارد، یان**

**٣-شوێنکەوتنی پێغەمبەری(صلى الله عليه واله وسلم) بەواجیب نەئەزانی هەم لەعەقیدەداو هەم لەعیبادەتداو هەم لەتەفسیری دیندا، یان**

٤- دیفاعی لەپێغەمبەرو فەرموودەو سوونەتەکانی نەئەکردو بەرزڕاینەئەگرت و ئەوەی هەیبوو نەیئەکردە قەڵغان بۆی لەبەردەم قسەو رەفتاری ناشایستەی دوژمنەکانیداو سانابوو لای کەسووکایەتی پێبکرێت، یان
٥- پێغەمبەری(صلی الله علیەوالەوسلم)بەمەعصوم نەئەزانی بەتایبەتی لەگەیاندنی پەیامی خواداو وایئەزانی کەپێغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم)هەندێ لەئیسلامی شاردووەتەوەو ناپاکبووە(حاشابێت) بەرانبەر بەو سپاردەیەی خوا بۆی ناردووە، یان
٦-پێغەمبەری(صلی الله علیەوالەوسلم) بەکاملترین کەس نەئەزانی لەدونیاداو شوێنکەوتنی ئەوی بەمایەی جوانی و سەربەرزی دین و دونیا نەئەزانی، یان
٧- بەرێزەوە بۆ پێغەمبەری(صلی الله علیەوالەوسلم)نەئەڕوانی و چاوی لێنەئەکردو ئیقتیدای پێوەنەئەکردو بڕوای وانەبوو کەوەك چۆن لەژیانی دینداریدا کەسێکی کامڵ بووە هەرواش لەژیانی دنیاییدا کەسێکی کامڵ بووە، ئەوە بەراستی ئەو کەسە شایەتمانەکەی خۆی پووچکردووەتەوەو دوورکەوتووەتەوە لەدین و لەبازنەی ئەم

دینــە چــووەتەدەرەوەو پێویســتە خێــرا بەخۆیــدا بچــێتەوەو سەرلەنویٚ ئیمانەکەی و شایەتیدانەکەی بۆخواو بۆپێغەمبـەر تازەبکاتــەوەو رزگاریبکــات لــەو نەواقیزانــە...خــوای گــەورە ئەفەرمویٚ:( كَيْفَ يَهْدِي اللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَشَهِدُوا أَنَّ الرَّسُولَ حَقٌّ وَجَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (٨٦) أُولَئِكَ جَزَاؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ (٨٧) خَالِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنْظَرُونَ (٨٨) إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٨٩)،

واتە: خوا چۆن هیدایەتی قەومێك ئەدات كەدوای ئیمانهێنـان و شـایەتیدانیان بۆ راسـتی پێغەمبـەر جارێكیتر كافربینـەوە، لەكاتێكــدا ئــەو هــەمووە بەڵگــە رۆشنانەشــیان بۆهــاتووە، لەراســتیدا خــوا خــەڵكانی ســتەمكار بەرچاورۆشــن ناكــات، ئائەوانــە شایســتەی ئــەوەن كەنــەفرینی خــواو فریشــتەكانی خــواو هــەموو مرۆڤــەكانیان داببارێتەســەر، هــەقی خۆیانــە بــەردەوام لــەناو ئــەو نەفرینــەدا بمێننــەوەو ئازاریــان لەســەر سووكنەكرێت و مۆڵــەتیان نــەدرێت، مەگــەر ئەوانــەیان نــەبێت كــەدوای ئــەوە بەخۆیانــدا ئەچــنەوەو تۆبەئەكــەن و ئــەوەی

خراپیانکردووەو چاکینەکەنەوە، دڵنیاشبن کەخوا لێبووردەو بەسۆزە.

بەکورتی و بەکوردی: هەرکەس لەبازنەی شەهادەتیدا بۆخوا شەریکی بۆخوا بڕیار نەداو لەبازنەی شەهادەتیدا بۆ پێغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم) هاوڕێی بۆ پێغەمبەر بڕیارنەدا، یانی: کەسی نەکرد بەخوا یان نیوە خواو سیفەتێکی ئەوی نەدا بەو کەسە، هەروەها کەسی نەکرد بەپێغەمبەر یان نیوە پێغەمبەر(صلی الله علیەوالەو سلم)و سیفەتێکی ئەوی نەدا بەو کەسە، ئەوە رزگاریئەبێت، خۆ ئەگەر لەبەر کۆڵی گوناهەکانیشی ماوەیەك لەئاگرو زیندانی جەهەننەمدا بمێنێتەوە ئەوە لەکۆتاییدا هەر رزگاری ئەبێت بەبەڵگەی چەندین ئایەت و حەدیسی صەحیحی پێغەمبەرو بنەماکانی مەزهەبی ئەهلی سووننەت و جەماعەت و فەهمی سەلەف.

لەحەدیسی ئیمامی بوخاریشدا هاتووە:عوبادەی کوڕی صامیت(رەزای خوای لێبێت) ئەڵێ: کۆمەڵێك کەس بووین لەدەوری پێغەمبەر(صلی الله علیەوالەوسلم)، فەرموی پێمان:( بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا وَلاَ تَسْرِقُوا وَلاَ تَزْنُوا وَلاَ

تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ وَلاَ تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، وَلاَ تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ فِي الدُّنْيَا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِن ذَلِكَ شَيْئًا ثُمَّ سَتَرَه اللهُ، فَهُوَ إِلَى اللهِ، إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ، وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ ، **عوبادە(ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێ: ئێمەش هەموو پەیمانمان پێدا لەسەر ئەوە[٥٢].**

[٥٢] أخرجه البخاري في: ٢ كتاب الإيمان: ١١ باب حدثنا أبو اليمان.

## برگەی دووهەم

## هەڵسەنگاندنێك لەنێوان حیجاب و بێحیجابیدا

خوشکی موسڵمانی بێحیجاب بۆ ئەوەی دڵی قاییم ببێت و بڕیاری بێتە سەر ئەوەی حیجاب بکات و ببێتە کەسێکی بالآپۆش ، پێویستە بەراوردێکی هەمە لایەنە بکات لەنێوان حیجاب و بێحیجابیدا، بەڵکو ئەمە خوایە بڕیار بدات حیجاب بکات..

حیجاب:

١-فەرمانی خواو پێغەمبەری خوایەو خواو پێغەمبەری خواش شایستەی ئەوەن گوێڕایەڵییانبکرێت.

٢-خوا پێی خۆشەو پێی ڕازیەو ڕازیکردنی خواش شتێکی کەم نیە بۆ مرۆڤ.

٣-کەسایەتیم ئەپارێزێ لەناو خزمان و هاوەڵان و خەڵکیدا.

٤-بۆ قیامەتم باشەو بۆ دونیاشم هەر باشە.

٥-جەستە و ڕۆحم ئەپارێزێ.

٦-وەك موسڵمانێکی بەهێز ئەمناسێنێت.

٧-لەمردن ناترسم و دڵئارامم.

٨-نابمە فیتنە بۆ کەس بەڵکو ئەبمەخێر بۆیان.

٩-گوناهبار نابم و حیجابەکەشم عیبادەتە.

١٠-قەڵغانێکە لەخراپەو کەسی خراپ ئەمپارێزێ.

١١-نابمە ماڵوێرانی بۆ هیچ کەسێك.

بێحیجابی:

١-فەرمانی نەفس و شەیتانە.

٢-خوا پێی ناخۆشەو پێی زوویرئەبێت.

٣-کەسایەتیم ئەفەوتێنێ.

٤-بۆ قیامەتم خراپەو بۆ دونیاشم هەر خراپە .

٥-جەستەم چرچ ئەکات و ڕۆحم چڵکن ئەکات.

٦-وەك موسڵمانێکی لاواز ئەمناسێنێ.

٧-بەردەوام خەمی مردنمەو لێی ئەترسم.

٨-بەردەوام بۆ خۆم و بۆ خەڵکیش ئەبمە فیتنە.

٩-بەردەوام لە گوناهدا ئەژیم و بێحیجابیەکەم خۆی گوناهە.

١٠-کەسانی خراپ تەماحم تێئەکەن و لاواز ئەبم بەرامبەر گوناه .

١١-بەردەوام باری گوناهی خۆم و دایك و باوکیشم قورس ئەکەم

## بڕگەی سێیەم

## چەند هەنگاوێك بەرەو حیجابکردن

لەم بڕگەیەدا بەباشی ئەزانین کە ئەزموونی هەندێ لە خوشکانی حیجابلەبەر باسبکەین کە پێشنیارئەکەن بۆ ئەو ئافرەتە موسڵمانانەی کە تائێستا بڕیاری ئەوەیان نەداوە حیجاب بکەن، هەنگاو بەهەنگاو لەحیجابکردن نزیکببنەوە نەك هەنگاوبەهەنگاو لە بالاپۆشی دووربکەونەوە.

پێشنیاری ئافرەتێك کە دڵی بۆ ئەو جۆرە ئافرەتانە ئەسوتێ کە موسڵمانن و بەدینن، بەڵام بەداخەوە ئەوەندە ئیرادە لاوازە ناتوانێ بڕیاری ئەوە بدات کەبالاّی بپۆشێت و دەستبەرداری بێحیجابیەکەی ببێت، ئەو ئافرەتە بەڕێزە ئەڵێ:

خوشکە باشەکەم! ئەگەر لەبارودۆخێکدای بوویت بۆت نەئەچووەسەر بەیەکجاری دەستبەرداری بێحیجابی ببی و حەزیشت لە بالاپۆشی ئەکرد، ئەوە ئامۆژگاریم وایە کە:

١-هەوڵبدە بە بێ لەچك نەچیتە دەرەوە لەماڵ بۆ بازاڕو یان شوێنە گشتیەکان.

٢-ئەگەر پانتۆڵت کڕی بازۆر تەنگ و تەسك نەبێت و لەمڕۆ بەدواوە پانتۆڵێك بکڕە لەپانتۆڵەکانی ترت فراوانتر بێت.

٣-هەوڵ بدە چاکەتێك بەسەر پانتۆڵەکەتدا لەبەر بکە کە تانزیك ئەژنۆکانت دابپۆشێت.

٤-هەوڵبدە نوێژەکانت هەموو لەکاتی خۆیاندا بکەی و لەکاتە تەنیاکاندا دوعای زۆر بکەی تاخوا دڵت قایمبکات و بتخاتەسەر ئەو بڕیارەی کە بالاپۆشی تەواوو یەکجاری بکەیت.

٥-کتێبی زۆر بخوێنەرەوە لەسەر ئیسلام بەگشتی و لەسەر بالاپۆشی بەتایبەتی، چونکە هەر کتێبێك بەشی خۆی کاریگەری لەسەرت دروستئەکات.

٦-هەوڵبدە کە هاتوچۆی مزگەوت زۆر بکەیت، بەشداری وانەکانی مزگەوت بکەیت، بەڵکو ئەمە خوایە لەناو ئەو کەشە ڕۆحیانەدا ئیمانت تەکانێکی زیاتر بدات و هەنگاوێك زیاتر بچیتە پێشەوەو نزیکتر بکەویتەوە لەبڕیاری مێژوویی خۆت.

٧-هەوڵبدە هەندێ هاوڕێی بالاپۆشی ڕۆشنبیر پەیدابکەی، هاتوچۆو ئامۆشۆکردن بکەوێتە نێوانتان، ڕا گۆڕینەوە دروستببێت لەنێوانتاندا، تا ببێتە هاوکارو پشتیوانت، بەڵکو ئەمە خوایە ئەو ترسەی هەتە لە بالاپۆشی بڕەوێتەوەو

ڕزگارتببێت لێی و هەنگاوی خێرا بنێیت بۆ شانشینی حیجاب و لەوێدا ئارامبگری.[٥٢]

خوشکێکی تر ئەزموونی خۆی ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ:

من کە ئافرەتێکی حیجاب لەبەرم ئەدی خۆزگەم پێئەخواست، لەبەر خۆمەوە ئەمووت: خۆزگەم پێت، بەڕاستی خۆشبەختی، خۆزگە منیش خوا ئەوەندە ئازای ئەکردم وەك تۆ لەچکم بکرادایە و بالآم بپۆشیایە..

ئەوە بوو بەردەوام بەم خۆزگەیەوە ئەژیام، تاڕۆژێکیان لەگەڵ ئافرەتێکی حیجابلەبەری ڕۆشنبیردا بوومە هاوڕێ و درەختی خۆشەویستی ڕووا لەنێوانماندا، ئەو خوشکە خوا خێری بنوسێت، ماوەیەکی زۆر دەستی لێبەرنەدام تا هاتمە سەر ئەو بڕیارەی بالآپۆشی بکەم، سەرەتا لەچکم ئەکرد، بەلآم بۆ نەفس پەرچەمەکەم دەرئەهێنا لەژێر لەچکەکەمەوەو قژیشم بەرزئەکردەوەو جارجارەش میکیاجی جۆربەجۆرم ئەکرد..

ئەو خوشکە بەردەوام خۆی قسەی بۆ ئەکردم و جارجارەش کتێبی ئیسلامی بۆ ئەهێنام و منیش ئەمخوێندنەوە، یەکێك

[٥٢] ئەزموونی ئافرەتێکی میسریە لەسایتی()وەرگیراوە.

لەو کتێبانە بریتیبوو لە(ئەو ئافرەتەی کە بەدوای خۆیدا ئەگەڕێت)، ئەم کتێبەم خوێندەوەو پاشان کتێبی(ئەو ئافرەتەی خۆی دۆزیەوە)ی بۆ هێنام، کە ئەو دوو کتێبەم خوێندەوە تەواو قەناعەتم گۆڕاو بڕیارم هاتەسەر ئەوەی کە نەك حیجابەکەم چاك و توونـد بکەمەوە بەڵکو بڕیارم هاتەسەر ئەوە کە بۆ دەرەوە(عەبا)ش بپۆشم وەك زیادە گەردنگیریەك بە دینەکەمەوە..

ئەم هەنگاو بەهەنگاو ڕۆیشتنە لەحیجابکردا بۆ ئەو کەسانە باشە کەفشتاری ماڵیان لەسەرە و ئەوان ناهێڵن حیجاب بکات، یان بۆ ئەو کەسانە باشە کەئیرادەیان لاوازەو لەخوتوخۆڕایی لە بالآپۆشی ئەترسن و ئەو وەهمە ناشکێنن.

خوای گەورە حیجابی بەچەند قۆناغ فەرزکرد، عارەق خواردنەوەی بەچەند قۆناغ حەرامکرد، زیناکردنی بەچەند قۆناغ قێزەون و حەرامکرد، ئیمامی بوخاری لە دایکمان عائیشەوە ئەگێڕێتەوە کە دەربارەی دابەزینی ئایەتەکانی قورئان فەرموویەتی:

(إنما نزل أول ما نزل منه سورة من المفصل، فيها ذكر الجنة والنار حتى إذا ثابَ الناس الى الاسلام نزل الحلال والحرام، ولو نزل أول شيء لا تشربوا الخمر، لقالوا لا ندع الخمر أبدا، ولو نزل لا تزنوا لقالوا لا ندع الزنا أبدا)

**واتە: یەکەمین جارێك کە قورئان دابەزی چەند سورەتێکی(درێژ)[٥٤] هاتەخوارەوەو باسی بەهەشتو ئاگریان تێدا ئەکرا تا ئەوە بوو کە خەڵکی گەڕانەوە بۆ لای ئیسلام، حەڵاڵو حەرامیش دەستیان کردە دابەزین، جا ئەگەر یەکەم شت ئەو دابەزییایە و بیوتایە (عارەق مەخۆنەوە) خەڵکی ئەیانوت هەرگیز دەست لەمەی خواردنەوە هەڵناگرین، یان ئەگەر ئەمە دابیەزییایە و بیویتایە (زینا مەکەن) خەڵکی ئەیانوت هەرگیز دەست لە زیناکردن هەڵناگرین. پێغەمبەریش(صلی اللهعلیهوالهوسلم)کە موعزی کوڕی جەبەلی نارد بۆیەمەن تا خەڵکی ئەویٚ فێری ئیسلام بکات، پێیفەرموو:**« إِنَّكَ سَتَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ فَإِذَا جِئْتَهُمْ فَادْعُهُمْ إِلَى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ

---

[٥٤] سورەتە (درێژ-مفصل)ەکان ئەو سورەتانەن کە لەسورەتی (ق) یان (الحجرات)ەوە دەستپێئەکات بۆ کۆتایی قورئانو ئەکرێن بەسێ بەشەوە (زۆر درێژ)و (میانەکان)و (کورتەکان).

فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللهَ قَدْ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنَ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ بِذَلِكَ فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللهِ حِجَابٌ»[٥٥]، **یانی: کەمێکی تر تۆ ئەچیتەلای خەڵکانێك کە ئەهلی کتێبن، کە چوویتەناویان بانگیانبکە بۆ ئەوەی شایەتی بۆ تاك وتەنیایی خوابدەن و شایەتی بۆ پێغەمبەرایەتی مەحەممەدیش بدەن، ئەگەر ئەمەیان بەگوێکردی ئەوجا هەواڵی ئەوەیان پێبدە کە خوای پەروەردگار لەشەوو رۆژێکدا پێنج فەرز نوێژی داناوە لەسەریان، ئەگەر ئەمەیان بەگوێکردی ئەوجا هەواڵی ئەوەیان پێبدە کە خوای پەروەردگار زەکاتێکی لەسەر فەرزکردوون لەدەوڵەمەندەکانیان ئەسەنرێت و دابەشئەکرێتەوە بەسەر هەژارەکانیاندا، ئەگەر ئەمەیان بەگوێکردی ئەوە خۆت بپارێزە لەسامان نەختینەکانیان، خۆشت لەنزای کەسی**

[٥٥] رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ فِي الصَّحِيحِ عَنْ مُحَمَّدٍ وَغَيْرِهِ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ ، وَأَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ مِنْ وَجْهٍ أُخَرَ عَنْ زَكَرِيَّا.

مەزلوم بپارێزە چونکە لەنێوان ئەو نزاو خوای پەروەردگاردا پەردە نیە.

"شێخ عەلی تەنتاوی" ئەڵێ: کاتی خۆی دەوڵەتی یابان ویستیان لەراستی ئیسلام تێبگەن، داوایانکرد لەدەوڵەتی عوسمانی ئەوکاتە چەند زاناو شارەزایەکیان بۆ بنێرن تا ئیسلامیان بۆ رۆشنبکەنەوەو وەلامی پرسیارەکانیان بدەنەوە، دەوڵەتی عوسمانیش چەند زانایەکیان بۆ ناردن، ئەوانیش بۆ رێزی زیاتر لەو شاندە ئیسلامییە هاتن خوانێکی گەورەیان بۆ رازاندنەوەو جۆرەها خواردنو خواردنەوە لەوانە(چەندان جۆری مەی وعارەق)یان بۆ ئامادەکردن، کەزاناکان عارەقەکانیان بینی سڵەمینەوەو عادزبوونو دەستیاندایە درێژەی باسکردنی حوکمی عارەقو عارقە خواردنەوەو دروستکردنی و فرۆشتنی، ئەوانیش حەپەسانو وتیان: جا ئەگەر ئەم دینە وابێ دیارە بەکەڵکی ئێمە نایەت!

"علی تەنتاوی" -بەرەحمەتبێت- دەڵێ: خوای گەورە لەو زانایانە ببورێت، ئەبوو سەرەتا باسی (توحید)و خواناسینیان بکردایەو کە لەوە ئەبوونەوە، پاشان باسی

لـق و پۆپـەکانی شـەریعەتیان بکردایـە هـەروەك چـۆن پێغەمبەر(صلی اللەعلیەوالەوسلم) بەموعازی فەرموو کاتێك بۆ لای یەمەنی نارد: موعاز سەرتا بانگیانبکە بۆ لای (لا الە الا اللهو محمد رسول الله)، ئەگەر ئەوەیان لێوەرگرتی ئەوجا بانگیانبکە بۆ نوێژو پاشان بۆ زەکاتدان و.. بەو شێوەیە.

لەوانەیە کەسانێك هەبن ئەم قسانە بەناشەرعی و جۆرێك لەبانگەشە بدەنە قەڵەم بۆ پلەبەندي لەبالآپۆشیدا، ئەم قسانە بـۆ ئـەوە نیـە کـە سـەرپۆش و بـانتۆڵی تەسـك بـەحیجابی شـەرعی دابنرێـت، یـان قژدەرخسـتن و بـەرگی بریـق و بـاق لەبـەرکردن بەهەنـد وەربگیرێـت..ئێمـە ئەوەنـدە قسـەمان لەپێشـەوە کـرد لەسـەر حیجـاب و مەرجـەکانی حیجـابی شەرعی کە کەس بیری بۆ وەها گومانێك نەڕوات، بۆیە ئەمە تـەنیا وەك هەنـدێ ئـەزموون باسمـانکرد کـە خاوەنـەکانی بۆخۆیـان یـان بـۆ هـاوڕێ و ناسـراوەکانیان سـوودیان لێبینیـووە، ئیمامی عـەلیش ئەفەرموێ: (کان لي فیما مضی اخ في الله وکان یعظمه في عیني صغرالدنیا في عینه .. وکان لایلوم احدا علی مایجد العذرفي مثله حتی یسمع اعتذاره، وکان لایشکوا وجعا الا عند برئه،

وكان علی مايسمع احرص منه علی ان يتكلم، وكان اذا برهه امران نظرايهما اقرب الى الهوى فخالفه)[56].

**کاتی خۆی برایەکی ئیمانیم هەبوو، ئەوەی لەبەرچاوم گەورەی کردبوو ئەو بچوك سەیرکردنەوەی ئەوبوو بۆ دونیا، هەرگیز لۆمەی کەسێکی نەئەکرد لەسەر کارێك کە بیانوو هەبێت بۆ کاری لەوجۆرە تا گوێی بۆ ئەو کەسە نەگرتایە، هەرگیز شکاتی لەنخۆشیەك نەئەکرد تا چاکئەبوویەوە، زۆرتر لەهەوڵی گوێگرتندا بوو تا قسەکردن، ئەگەر دوو کار بهاتایەتەرێگەی سەیریئەکرد کامیان حەزی نەفسی لەگەڵدا بووایە ئەوە پێچەوانەکەی ئەکرد..**

**لەراستیدا هەر ئەزمونێك لەهەرشوێنێکدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، جێگەی خۆیەتی کەچاوی لێبکرێت، ئەو ئەزموونە لەناو بەرەی صەحابە بەڕێزەکاندا بووبێت، یان لەناو تابعیندا بووبێت، یان لەم ڕۆژگارەدا بێت، لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بووبێت، یان لەناو کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایدا بووبێت..**

---

[56] نهج البلاغة، ص٦٩٣

لەوانەیە دەیان کەس هەبێت دەیان ئەزموونی تایبەتی خۆی هەبێت لەهێنانی ئافرەتانی بێحیجابدا بۆناو بازنەی بالآپۆشی، هیچ رێگرێك نیە لەوەدا سوود لەو ئەزموونانە وەربگیرێت، ئێمە سێ خاڵمان بەگرنگ زانی بۆ هێنانی ئەو ئافرەتانەی کە بەنیازن بالآپۆشی بکەن کەچی ژینگەکەیان یان دەروونیان رێگەیان پێنادات ئەو بڕیارە بدەن، ئێمە سێ خاڵمان بەگرنگ زانی:

یەکەم: دروستکردنی هەندێ قەناعاتی فیکری سەبارەت بەبالآپۆشی، چونکە فیکرو قەناعەت ئاراستەی مرۆڤی تەندروست ئەکات.

دووەم: بەراوردکارییەکی سادە لەنێوان بێحیجابی و بالآپۆشیدا.

سێیەم: بڕیاربدات هەنگاوبەهەنگاو لەبێحیجابی دووربکەوێتەوەو بەرەو بالآپۆشی بڕوات.

جێگەی خۆیەتی بەوە دڵخۆشبین کە کەسێك ئەبینین هەنگاو بەهەنگاو لەبالآپۆشی نزیکئەبێتەوە، وەك چۆن بەوە دڵگران و خەمبار ئەبین کە یەکێکی تر ئەبینین هەنگاو بەهەنگاو بەرەو فڕێدانی حیجاب ئەڕوات.

**ئیمــامی بــەننا بەڕەحمــەت بێــت چــەند جــوان ئەفــەرموێ:**(انك ان دخلت على مريض فوجدته تدرج من كلام الى صمت و من حركة الى سكون شعرت بقرب نهايته وعسر شفائه واستفحال دائه، فأذا انعكس الآمر واخذ يتدرج من صمت الى كلام ومن همود الى حركة شعرت بقرب شفائه وتقدمه في طريق الصحة والعافية)[٥٧]، **ئەگــەر چــوویتەلای نەخۆشــێك و ببینیــت پلەپلــە حــاڵی خراپئــەبێت، ســەرەتا قســەی نامێنێــت و بیــدەنگ ئــەبێت و پاشــانلەجوڵە ئەكــەوێت هەســتی ئــەوەت بــۆ دروســتئەبێت كەچاكبوونەوەی نارەحەتــەو نەخۆشیەكە لێــی پیسكردووە، بــــەلآم خۆئەگــــەر شــــتەكە پێچــــەوانەوەبوویەوە، پلەپلــــە لەبێدەنگیــەوە كەوتەقســەكردن و لــە تەختكەوتنــەوە كەوتــە جوڵە ئەوهەستەت بۆ دروستئەبێت كە چاكبوونەوەی نزیكەو پێشكەوتن بەخۆیەوە ئەبینێت بەرەو باشبوونەوە ئەڕوات.**

**زانایــان ئــەوەیان ســاغكردووەتەوە كــە خراپــە كەمكردنــەوەو دەســتگرتنی خــەڵكی بۆئــەوەی پلەپلــە بــەرەو ئیســلامەتی و دادی ئیسلام بێت كارێكی چاكەو وازنەهێنان لەخراپەش تا**

---

[٥٧] مجموعة الرسائل الامام الشهيد حسن البنا (الجزء الاول / ص ٥٦) .

**بەتەواوی بنەبڕنەبێت چاکی چاکترە و هەردوکیشیان هەر خێرن.**

**ئیبن تەیمییە-بەرەحمەت بێت-ئەڵێ:**( والمعين على الإثم والعدوان: من أعان الظالم على ظلمه، أما من أعان المظلوم على تخفيف الظلم عنه أو على المظلمة فهو وكيل المظلوم لا وكيل الظالم، بمنزلة الذي يقرضه أو الذي يتوكل في حمل المال له إلى الظالم، مثال ذلك ولي اليتيم والوقف إذا طلب ظالم منه مالا فاجتهد في دفع ذلك - بمال أقل منه إليه - أو إلى غيره بعد الاجتهاد التام في الدفع فهو محسن وما على المحسنين من سبيل..).[58]

**لەهەمان کتێبداو لەلاپەڕە ٦٤دا ئەڵێ:**( فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى بَعَثَ الرُّسُلَ لِتَحْصِيلِ الْمَصَالِحِ وَتَكْمِيلِهَا، وَتَعْطِيلِ الْمَفَاسِدِ وَتَقْلِيلِهَا بِحَسَبِ الْإِمْكَانِ.)

**خوای پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەوەی بەرژەوەندیەکانی خەڵك دەستەبەربکەن و بەرەو کەماڵی بەرن، خراپەکانیش بکوژێننەوەو کەمیان بکەنەوە ئەوەندەی پێیاننەکرێت و ئەیتوانن.**

---

[58] السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية،ص٦٥.

## قسەی کۆتایی

ئــەوە بــۆ ماوەیــەکی زۆرە میلــەتان و هەرێمــە ڕۆژهەلاتیەکان کەوتونەتە ژێر هێزی داگیرکەرانی ڕۆژئاواوەو ڕۆژئاواش بـەپێی بەرنامەیـەکی وردی بۆداڕێـژراو خـەریکی هەنـدێ گەنـدەڵکارین و مەبەسـتیانە شیرازەی بتـەوی خێزان لـەناو کۆمەڵگە ئیسلامیەکاندا لەگێژنـە دەربهێنن و حیجـابی ئافرەتان لەبەریان دابکەنن..

لەوانەیــە هەنــدێ کـەس ئـەم قسـەیە بەموبالەغـەو (تیۆری پیلان=نظرية المؤامرة) بزانن، بـەلام لەڕاستیدا ئەوە ڕاســـتەقینەیەکە هەنـــدێ کەســـی گومانـــاوی هـــەوڵی شاردنەوەیان ئەدەن بەدوو مەبەست: یەکەمیان: داپۆشینی ڕووی ناشــرینی سیاســەتە ڕۆژئاواییــەکان، دووهــەمیان: کپکردنەوەی هەستی دینی لەناو گەلی کوردستاندا.

کــاتی خــۆی بــەناوی یــەکێك لەســـەرانی جوولەکـــەوە ئەیانگێڕایەوە کە وتوویـەتی:( كأس وغانيـة تفعلان في تحطيم الأمة المحمدية أكثر مما يفعله ألف مدفع ، فأغرقوها في حب المادة والشــهوات)، پێکێـك عـارەق و ئـافرەتێکی گۆرانیبێـژ ڕۆڵیـان لەرووخاندنی ئوممەتی موحەممەدیدا زیاترە لـە هـەزار تـۆپی

دوورهاویژ، بۆیە نوقمیانبکەن لەناو پارەو ئارەزووپەرستیدا، بەناوی گلادستۆنی سەرۆك وەزیرانی جارانی بەریتانیاوە ئەیانگێڕایەوە کەوتوویەت:( ئەوروپا ناتوانێت بەسەر ئیسلام و دونیای ئیسلامیدا زاڵببێت تا سەرپۆشی سەر ژنان دانەماڵێت و قورئانی پێدابپۆشێت لەناویاندا! ئێمە زۆر بڕوامان نەئەئەکرد کەئەو قسانە وابن، کەچی لێدوانەکانی ئەم سەردەمە تازانە هەموو ئەو قسانەی پێشتری سەلماند.

جۆرج دەبلیو بۆش لە٢٠٠٢/١/٢٩داو لەبەردەم کۆنگرێسی ئەمریکیدا ئەم ووتارەی لایخوارەوەی داو زۆر بەڕاشکاوانە باس لەوە ئەکات کەئەوان بەرنامەیان داناوە بۆئەوەی گەنجانی ولاتە ئیسلامیەکان دابڕێن لە(چەك)و (ڕیش)و (دین)و لە(حیجاب)!!

زۆر سەیرە ئەوان کارئەکەن بۆ ئەوەی کە خەڵك(جگەرەخۆر)بێت! (عارەقخۆر )بێت، خەڵك ئازادبکرێت لەمومارەسەی سێکسیدا، لەخیانەی زەوجیدا، لەجوتبوندا لەگەڵ هاوڕەگەزی خۆی، لەگەڵ مەحرەمەکانی خۆیدا !!

کارئەکـەن بـۆ ئـەوەی کەفلیمـە بەرِەلاَییـەکان بەرنـە هـەموو ماڵێك! هەروەها بیبەنە ژووری خەوتنەکانیان !!
کارئەکەن بەبەرنامە بۆئەوەی هەموو ئەو کۆمپانیایانەی کە ئـەم جـۆرە فلیمانـە بەرهمئـەهێنن تـەواوی ئازادیـان بـۆ دەستەبەربکەن و ڕێگر لەبەردەمیاندا نەهێڵن تاگەلان ئازادبن لەپەیوندیکردن بەو کۆمپانیایانەوە! ئەم قسانە بوختـان نـین، قسـەی خـەڵکی لاکـۆلاَن و نابـەپرس نـین، بـەڵکو قسـەی بەرپرسـێکی گـەورەی وەك جـۆرج بۆشـە کـە(٨) سـالْ ئـەو سەرۆکی ویلایەتە یەککرتووەکانی ئـەمریکا بوو، لەکوێیشـدا ئەم قسە ترسناکانە ئەکات: لەبەردەم کۆنگرێسی ئەمریکیـدا، ئەمەش دەقی وتارەکەیەتی:
( سەرۆکی بەرِێز!
ئەندامانی بەرِێزی کۆنگرێس!
هاولاَتیە ئەمریکیەکان!
پێمخۆشـــە بەهـــەموو شـــانازیەکەوە ئـــەوەتان پێبڵـــێم: هەلومەرجی هاوپەیمانێتی مەسیحی و یەهودیـە دەوڵەمەنـدو سپی پێستەکان تەواو بەهێزە، هیچ کاتێك لەمێژووی ئێمـەدا ئەمریکاو دەسەلاَتی ئەمریکا ئەوەندە بەهێز نەبووە، هەرگیز

ئەمریکا ئەوەندە بەهێزو بەسام و بەڕێز نەبووە لای جیهان وەك ئـــەمڕۆ ئـــەیبینن، ئـــەمڕۆ ئـــالآی ئـــەمریکاو ئـــالآ سەربازیەکانی ئەمریکاو دەزگای سەنتەری سیخوڕی(سی ئای ئەی)و نوسینگەی توێژینەوەی فیدڕاڵی لەناو زیاتر لە(١٠٠)دەوڵەتدا هەیە، بۆ دەستەبەرکردنی ئاشتی و ملکەچکردنی خەڵك و ڕزگاربوون لەترس و تۆقاندن ..

پێویستە ئەمریکیەکان شانازی بەمن و بەحکومەتەکەیانەوە بکەن، پێویستە شانازی بەپیاوان و ژنانی هێزی سەربازیەوە بکەن، ئەوانەی کە قوربانی ئەدەن بەجوانیەکانی دنیا بۆ ئەوەی شێوازی ژیانی ئەمریکی بەردەوام بێت و هەربمێنێ.

من زۆر شانازی بەوەوە دەکەم کە تاڵیبان خۆیان خستەناو پرۆسەیەکی خۆکوژیەوەو کابوڵیش ئازادکراو ئوسامە بن لادن و مەلا محمد عومەریش: یان ئەوەیە کوژراون یان ئەوەیە خەریکە گیان ئەسپێرن، یان ئەوەیە کە خۆیان شاردۆتەوە، بەلآم بۆ کاتێکی کەم نەك زۆر، من لەسەر ئەوەش سوورم کە هەر ئەبێ تەسلیم ببن و دادگایان بکەم، ئیتر بەزیندووی بن یان بە مردووی، ئەمەوێ ئەوەشتان پێڕابگەیەنم کە ئافرەتە ئەفغانیەکان بۆ هەتا هەتایە

دەستبەرداری پەچەکانیان بوون! کچانی ئەفغانیش گەڕانەوە بۆ قوتابخانەکانیان تالەوێدا وانەی(ئێمە بەهۆی ئەمریکای ڕۆژئاواوە سەرکەوتنمان بەدەستهێنا)بخوێنن، دڵنیابن لەوەی کە دروشمەکانی شارستانێتی و ڕۆشنبیری ڕۆژئاوا – کەلەهەموو شتێك گرنگترە– گەڕایەوە بۆ ناو ژیانی ئەفغانیەکان کە ئەویش بریتیەلە: تەلەفزیۆن، ئەفغانیەکان ئێستا دڵخۆش و ئازادن لەوەدا لەکوێدا بیانەوێ(ئەفیون) ئەچێنن!! لەگەڵ ئەوەدا کەجەنگ لەئەفغانستاندا خەریکە ئەگاتە کۆتاییەکەی، بەلآم ئەبێ بزانن ڕێگەیەکی دوورودرێژمان لەبەردەمدایە کەپێویستە بیبڕین، لەزۆرێك لەولآتە عەرەبی و ئیسلامیەکاندا، نابێ ڕابوەستین و پێویستە وا بکەین کە ئەوەی پێیئەوترێت: عەرەب و موسڵمان دایبڕین لەچەك و ریشی پێبتاشین و لە دینی بکەین و بیکەینە کەسێکی ئاشتیخوازو داهێنەرو دڵهێنەر بۆ ئەمریکاو نەهێڵین دەم و چاوی ژنەکەی بە پەچە دابپۆشێت !!

من لەسەر ئەوە پێدائەگرم کەپێویستە هەموو داهاتەکانمان خەرجبکەین بۆ بەدەستهێنانی ئەم ئامانجە پێش ئەوەی کە بۆ جارێکی تر بۆ سەرۆکایەتی هەڵبژێرێمەوە..

ئیدارەکەی من بەگرنگیەوە خەریکی دانانی سیاسەت و پلانێکە بۆ وزەی میللی لەژێر سەرپەرشتیاری(دیك تشینی)جێگری سەرۆکدا، لەداهاتوویەکی زۆر نزیکدا دەست بەهەڵکەندنی بیری نەوتی ئەکەین لەهەموو کەنارەکانی ولآتەکەماندا، بۆدرووستکردنی پرۆژەیەکی گەورەش لەژێر دەریا لەولآتی سعودیەو کەنداو ئێران و عێراقدا کەڕاستەوخۆ پەیوەستی بکەین بە(نیوۆورك)ەوەو لەسەر خەرجی خۆشیان!!(تاسەرچاوەیەکی نەوتی نەبڕاو مسۆگەر بکەین !)بۆ ولآتەکەمان.

بەدڵنیایەوە کاتی ئەوە هاتووە کەسەرلەنوێ جیهان فۆرمەلەبکەینەوە، تاوەك خۆمانی لێبکەین! بەهۆی نیعمەتی پەروەردگارمانەوە لەداهاتوودا ئێمەی ڕەگەزی سپی پێست لەم جیهان و شارستانیەتیەدا پێویستە بیروباوەڕی هاوسەنگ و خۆشەویست و ئازادیخوازی خۆمان فەرزبکەین بەسەر ئەم دونیایەدا کە برسیە بۆ سامان و بۆ پەیامی

ئێمە!! لەمەودوا کەس نابیّ ملکەچیکات بۆ ڕیشهێشتنەوە، یان ئافرەتان ملکەچبکەن بۆ مەرجی دەم و چاو داپۆشین و بالآپۆشی!!

لەمڕۆ بەدواوە هەموو جیهان ماڤی ئەوەی هەیە کە مەی بخواتەوەو جگەرە بکێشیّ و بەدرووستی لەگەڵ ژناندا یان بەنادرووستی یان لەگەڵ پیاواندا مومارەسەی سێکسی بکات، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ خزمە نزیکەکانی خۆشیدا بێت، یان نێربازی بکات یان خیانەتی زەوجی بکات!! خەڵك لەمەودوا ئازادە کە تالآنیبکات یان خەڵك بکوژێت یان سەیری فلیمی سێکسی و کاسێتی ڕووت و قوت بکات لەناو میوانخانەکاندا بێت یان لەناو ژووری نوستەنەکانی خۆیاندا بێت !

سەبارەت بەو کۆمپانیایانەی خۆشمان کە ئەم جۆرە شتانە بەرهەمدەهێنن ئەوە ماڤی ئەوەیان هەیە بەبیّ هیچ بەربەستێك بگەنە هەموو ئەو دەوڵەتە دواکەوتوانەی کە بەر لەم ئازادیانە نەگرێت لەناو گەلەکانیاندا !!

من ئومێدئەکەم کەتوانیبێتم پارێزگاریم لەکەلەپوری(ئال بۆش)کردبێت و بەزیندووی ڕامگرتبێت، بەوەی ئەوە

بەدرێــژایی(دە)ســاڵی تــەواوە ڕووبــەڕووی عــەرەب و موسڵمانەکان ئەبمەوە تائەوە دەستەبەربکەم هە شە خۆیـان و وڵاتەکانیان لەناو بشێویدا بن، ئومێددەکەم هیچ پادشایەك یان ئەمیرێکی عەرەبی خاوەن نەوت ناچاری ئەوەمان نەکەن بــەزۆر باشــترین بــەنزین بــۆ ســەیارە پێشــکەوتوەکانمان دابینبکــەن! هەرچــەندە ئــەوە تــا مــن ســەرۆکی ویلایەتــە یــەککگرتووەکان بم نایــەڵم ڕووبــدات، نــەك ئــەوە، بــەڵکو بەپێچەوانەوە ناچارئەبن کـە بـەردەوام بەرهـەم زیادبکـەن و نرخەکان دابەزێنن.[٥٩]

ئەمــە لێــدوانی ســەرۆکێکی بــەناوبانگی وەك ئەمریکایــە، ڕاشــکاوانە ئامــانج و کەرەســەکانی بەدەســتهێنانی ئــەو ئامانجانەش باسدەکات، کەچی سوپاس بۆ خوا لەقۆڵێکەوە ئەیبەنــەوە لــەقۆڵێکی تــرەوە ئەشــکێن و ئــەدۆڕێن، میللــەتێك دەستەمۆ ئەکـەن میللـەتێکی تریـان لێیاخیئـەبێت و لـەدژیان ئەوەســتەنەوە، نووســینێك ئەنووســن بــۆ چەواشــەکردن و بــەدبینکردنی خــەڵکی دەربــارەی ئیســلام، کەچــی دەیــان

---

[٥٩]. بـۆ ئاگــاداربوون لــە دەقــە ئینگلیزیەکــەی ســەیری ئــەم پێگەیــە بکــە WWW.Media monitors / khordr٦٠ .

نووسین لەوەلآمی ئەو نووسینە گومانا ویەدا ئەنووسرێت و ئەوەی ئەوان پووچئەکاتەوە ..

سەیرە ئەمریکا بەپلانێکی زۆر وورد ڕووداوی(سێبتەمبەری(٢٠٠١)ی درووستکردو ڕێخۆشکەری بۆ کرد، تا بەو ڕێگەیە بەر لەبلآوبوونەوەی ڕیش و حیجاب بگرێت و خەڵکی بەدبینبکات بەرانبەر بەئیسلام و پێغەمبەری خوا(صلی اللەعلیەوالەوسلم)، کەچی(سبحان اللە) وەك ئەڵێن: (انقلب السحر علی الساحر)، نەك ئەم ڕووداوە خەڵکی بەدبیننەکرد بەرانبەر ئیسلام، بەڵکو بەلێشاو هێنانی بەرەو ئیسلام و توێژینەوە لەئیسلام، نەك ڕیش و حیجابی کزنەکرد، بەڵکو ئەوەندەی تر برەوی پێدا لەناو ولآتانی خۆیاندا، ئەمە قسەی عاتفی نین، هی گیرفان و هی ئەم و ئەو نین، بەڵکو ئەم قسانە ئامارن، توێژینەوەن، هەر بۆ نمونە سەیری ئەم ئامارانە بکە :

( سەرژمێرییەك لە هۆڵندا ئاشکرایکرد کەپاش١١ی سێپتێمبەر، ئیسلام یەکەمین ئاینیە لەئەمستردامی پایتەختدا، ڕۆژنامەی (مترۆ) لە(٢٩/یۆلیۆ/٢٠٠٢)دا ڕایگەیاند کە (١٣٪)ی دانیشتوانی شاری ئەمستردام

موسڵمانن و ڕێژەی کاسۆلیك (١٠٪)یەو پرۆتستانت (٥٪)ەو جولەکەش (١٪)ن و ئەمەش وایکردووە کە زۆر لەدەزگا ئاینیەکان "جگە لەئیسلام" دەرگاکانیان دابخەن و کەلوپەلەکانیان بفرۆشن[60].

(سامو یلسون) کە توێژەرێکی سویدیە لەکاروباری موسڵماناندا ئەڵێ: ئیسلام بووە بەدووەم بیرو باوەڕی ڕەسمی لە(سوید)دا پاش مەسیحیەت، لەدوای ١١ی سێپتێمبەر سویدیەکان زیاتر لەجاران سەر لەمزگەوتەکان ئەدەن و پرسیار دەربارەی ئیسلام دەکەن.

ئیمامی مزگەوتی (ئوبسالا) لەسوید ئەڵێ: (بەئاشکرا دەڵێم جووڵەیەکی ئاشکراو کاریگەر هەیە لەناو سویدیەکانداو بەرەو ئیسلام دێن، ڕووداوی ١١ی سێپتێمبەر کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر شارەزا بوونی سودیەکان لەئیسلام، لە ماوەی دوو مانگی دوای ئەو ڕووداوە ژمارەیەکی زۆر لەپیاوان و ژنانی سویدی هاتن بۆ مزگەوت و بۆ

[60] المعجزة المتجددة، اليافي، ل ٣٥١ .

پرسیارکردن دەربارەی ئیسلام و زۆرێکیشیان لێ موسڵمان بوون.

–لەسویددا ئافرەتەکان ئازادن بە لەچکەوە وێنەی (معاملات)ەکانیان بگرن و هەموو کارەکانیان بۆ بەڕێوەدەبرێت و لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانیش بە لەچکەوە ڕوونکردنەوە دەربارەی ئیسلام دەدەن[61].

–پرۆفیسۆر هیوسلی کەساڵی ١٩٨٦ دکتۆرای وەرگرتووەو نامەی دکتۆراکەشی ناوی (بڵاوبوونەوەی ئیسلام بەهۆی عوسمانیەکانەوە لەئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتدا) ، ئەڵێ: (١١ی سێپتێمبەر) کاریکردەسەر حکومەتی کۆری و وایلێکردن لیژنەیەکی بەفراوان دابنێن بۆ توێژینەوە لەکارەساتی١١ی سێپتێمبەرو سندوقێکیشیان دانا بۆ دیراسەی جیهانی ئیسلامی و کاریگەری بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەسەر کۆریاو لیژنەکەش داوای لەحکومەتی کۆری کرد کە(مینحەی ئەکادیمی) زیاتر بدات بۆ دیراسە کردنی ئیسلام[62].

---

[61] هەمان سەرچاوە ، ل ٣٥٨ .

[62] هەمان سەرچاوە ، ل ٣٦٥

-لەساڵی (٢٠٠٢)داو لەبەرنامەی (بین السطور)ی کەناڵی (الجزیرە)دا هەواڵێکی بلأوکردەوە کە (١٤٥) جوولەکە لە فەلەستیندا موسڵمان بوون، یەکێك لەوانە گەنجێکەو (٢٨) ساڵ تەمەنیەتی و ناوی (سعید)ە: ئەو گەنجە ئەڵێ: (پاش ئەوەی هەواڵی موسڵمانبوونی (یوسف کۆهین[٦٣])م بیست منیش موسڵمانێتی خۆم ڕاگەیاند، هەرچەندە دایکم زۆری پێناخۆشبوو، ئەوەی ڕاستیبێت ڕووداوی١١ی سێپتێمبەر وایلێکردم کە زیاتر بەدوای ئیسلامدا بگەڕێم[٦٤].

-لەولأتانی ئەسکەندەناڤیا (رابیتەی ئیسلامی) کۆنفراسێکی بەست لە(٢٣تا٢٥)ی دیسێمبەری ٢٠٠٣ز کە باس لە ڕووداوی ١١ی سێپتێمبەرو کاریگەریەکانی ئەکات، لاوێکی قوتابی زانکۆی سوید لەکۆنفرانسەکەدا هەڵدەستێتەوەو موسڵمانبوونی خۆی ڕادەگەیەنێت، لەو کاتەشدا پیاوێکی

---

٦٣ [٦٣](یوسف کوهین) حاخامێکی گەورەی جولەکە بوو لە ئەمەریکاو سەر بە حیزبی شاسی توندڕەو بوو لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوەو پاش گفتوگۆیەکی چڕوپڕ لەسەر ئاین و فەلسەفە لە ساڵی (٢٠٠١)دا لەسەر دەستی بانگخوازێکی ئیسلامی ناو ئەنتەرنێت موسڵمان ئەبێت و ئەکەوێتە بانگخوازی بۆ ئیسلام و لە خێزانەکەشیەوە دەستی پێکرد (بڕوانە المعجزه المتجدده ل ٣٩٨).

[٦٤] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە

پیری سویدیش(ڤێلاکەی) خۆی ئەکاتە(وەقف) بۆ ئەوەی بکرێتە بنکەی لەبەرکردنی قورئان[65]!!.

"ئاشوك كولن یانق" یەکێك بوو لەگەورە قەشەکانی خواروی سودان، ئەمینداری گشتی کۆڕی کڵێسای جیهانی بووە بۆ ڕۆژهەلأت و ناوەڕاستی ئەفریقا لەساڵەکانی (١٩٩٢) بە دواوە، لەساڵی(٢٠٠٢)دا موسڵمانێتی خۆی ڕاگەیاند، لەچاوپێکەوتنێکی گۆڤاری (المجتمع) كوێتی ژمارە (٦٢٩)ی ٢٠٠٢دا لەگەڵ ئاشکۆکدا زانیاریەکی زۆری داوە دەربارەی ئەوەی کە ئەم پیاوە بۆتە هۆی موسڵمان بوونی زیاد لە (١٥٠٠٠٠) سەدو پەنجا هەزار کەس لەمەسیحیەکان، کە دوو هەزارو پێنج سەدیان قەشەو شارەزان لەنەصرانیەتدا.

- ساڵی (٢٠٠٦) لەئەمەریکا(٢١٢٠٠٠)دووسەدودوانزە هەزار گەنج و تازە پێگەیشتووی کوڕو کچ کۆبوونەوە لەباخچەیەکی گەورەی واشنتنداو بڕیاریاندا کە دەست لەداوێنپیسی هەڵگرن و پەیمانی داوێنپاکی بدەن بە

[65] هەمان سەرچاوە ، ل ٥٠١

یــەکتری!(١٥٠) کەســیان بــەجلی ســپیەوە چــوون بــۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ بۆشدا، وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو پاکێتیەو نارازیبوونیان لەسەر بەرەڵایی.

- لـەئێوارەی هــەمان ڕۆژدا (٢٥٠٠٠)بیســت و پێــنج هــەزار کوڕو کچ سروودی داوێنپاکیان ئەچڕی لەبەردەم کۆشکی سپیدا لەژێر ڕەهێڵەی باراندا.

_ لێکۆڵینــــەوەکان دەریانخســــتووە(٨٠٪)ی ئافرەتــــە ئەمریکییەکان حەزدەکەن بگەڕێنەوە سەر خوڕەوشتی بەرزو داوێنپاکی، لەتوێژینەوەیەکی تردا کە لەسەر(٤٠٠٠) چوار هــەزار ئــافرەت کــراوە، دەرکــەوت کــە(٦٠٪)یــان حەزناکــەن ئــازادی بــێ ســنوور بــدەن بەکچــەکانیان و (٧٥٪)یشــیان حەزدەکەن بگەڕێنەوە بۆ ژیانی خێزانی و داوێنپاکی، بەڵام ئـەوەی سـەیرە کـە (٨٧٪)ی ئـەو ئافرەتانـە نەیاندەویسـت یەکسـان بـن لەگـەڵ پیاوانـدا(و ئـەو مەسـەلەیەیان بـەزەرەرو زیان ئەزانی بۆ چینی ئافرەتان)[٦٦]!!.

---

[٦٦] بەرەو ئیسلام ، ئاسودەیی ، ئەندازیار عوسمان ، (٢/٧٠-٧١) .

دکتۆر وەلید فەتحی کەپزیشکێکی موسڵمانەو لەئەمەریکا کاردەکات ڕووداوەکانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژی ١١ی سێبتێمبەرمان بۆ ئەگێڕێتەوەو ئەڵێت:

(..هەر کە ڕووداوی ١١ی سێبتێمبەر ڕوویدا یەکسەر دەزگاکانی ڕاگەیاندن کە جولەکە ئاڕاستەیئەکردن دەستیانکردە تاوانبارکردنی موسڵمانان.

لەسەعات دوازدەی ئەو ڕۆژەدا لیژنەی بەڕێوەبەرایەتی مەرکەزی ئیسلامی لە(بۆستن) کۆبوونەوەیەکی نائاسایی پەلەیان ئەنجامداو منیش لەڕێگەی تەلەفۆنەوە بەشداریمکردو چەند بڕیارێك درا لەوانە: داوا لەدەسەلآتدارانی شار بکرێت کە بنکەکەمان بپارێزن لەکەسانی تێکدەرو ئاژاوەچی، ئەوانیش هێزێکی ئاسایشیان بۆ ناردین.

- ڕۆژی ١٢ی سێبتەمبەر دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەڕۆژنامەو تەلەفزیۆنەکانەوە بەپۆل ئەهاتن بۆ مەرکەزی ئیسلامی و داوای چاوپێکەوتنیان تۆماردەکرد لەگەڵماندداو دونیایەك پرسیاریان لەسەر ئیسلام و موسڵمانان ئەکردو ئێمەش وەلآممانئەدانەوە، (بەڕاستی ئەوەندە دژایەتیاندەکردین

بڕوامان وابوو کەئیسلام پەنجا ساڵ دێتە دواوە لەئەمەریکادا بەهۆی ١١ی سێپتێمبەرەوە !!

– ڕۆژی ١٣ی سێپتێمبەر لەگۆڕەپانی بەرامبەر بارەگای(عومدە)ی شاردا هەزاران کەس کۆبوونەوەو چەند کەسایەتیەکی ئاینی (گاورو موسڵمان) قسەیان بۆ ئەکردن، لەوێدا باسێکی چڕوپڕی بنەماکانی ئیسلام کراو پاشان درا بەتەلەفزیۆن و ملیۆنەها کەس بەدیاریەوە دائەنیشتن، ئەم کۆبوونەوانە لەهەموو شارەکانی ئەمەریکادا ئەنجامئەدران.

– ڕۆژی جومعەو لە١٤ی سێپتێمبەردا بەڕەسمی بانگکراین بۆ ئەنجامدانی کۆمەڵێك بەرنامەی تەلەفزیۆنی، و ئامادەکاریکرا بۆ ئەنجامدانی نوێژی جومعە لەبۆستن لەلای مەرکەزی ئیسلامیداو سەرۆکی کڵێسەکانیش بەشداریانکردو پاش نوێژ لەگەڵ موسڵماناندا بەشداری و ڕێپێوانێکیانکرد بۆ بەردەم بارەگای عومدەی شاری کامبردج و لەوێش باسی ئیسلاممان بۆ ئامادەبوان کردو لەدەزگاکانی ڕاگەیاندندا هەموو ئەوانە بلاوبوونەوە.

–لەڕۆژی ١٥ی سێپتێمبەردا چووم بۆ گەورەترین کڵێسەی شاری بۆستن کە بانگهێشتکرابووین بۆ باسکردنی ئیسلام و

لەوێش گەورە پیاوانی شارو کۆمەڵی ڕۆشنبیرو مامۆستای زانکۆش ئامادەبوون کەزیاتر لەهەزار کەس ئەبوون، هەروەها سەفیرەکان پێشوازیانلێکردین و گەورەترین قەشەی کڵێسەکە وتاریداو بەرگری لەئیسلام کردو ڕایگەیاند کەئیسلامیش ئاینێکی ئاسمانی و خوداییە!!

دکتۆر فەتحی بەردەوامەو ئەڵێت: منیش بەیاننامەی زانایانی ئیسلامم خوێندەوەو باسی هەڵوێستی ئیسلامم کرد لەبارەی تیرۆرەوەو بەدەنگەوە ئەم ئایەتەم خوێندەوەو بۆشم تەفسیرکردن: (مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ بَعْدَ ذَلِكَ فِي الْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ)، هەروەها ئایەتەکانی (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) وە ئایەتی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ) .. ئەوەی هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە ئەوە بوو: زۆرێك لەئامادە بووان لەو کڵێسەیەدا دەستیان بەگریان کرد، یەکێك لەئامادەبووان

وتـی: هەرچـەندە مـن هـیچ لـەزمانی عـەرەبی تێناگـەم، بـەلآم دیارە ئەوەی خوێندت بەڕاستی کەلامی خوایە! یـەکێکی تـر کە کاتێك لەکڵێسە چووە دەرەوە بەچاوێکی پڕ فرمێسکەوە خواحافیزی لێکردین و کاغەزێکی دایە دەستم، کە کردمـەوە سەیرئەکەم نووسیویەتی: (لـەڕابردوو لەئێستامان ببوورن و دوعامان بۆ بکەن) !!

یەکێکی تر لەوانە کەفرمێسکی بەچاودا ئەهاتەخوارەوە پێـی وتین:(بڕوامواییە ئێوەش هەروەك ئێمەن و بگرە چاکتریشن) !

.. لـەو کۆبوونەوەیـەدا هـەر خـەڵك بـوو داوای ناونیشـانی مەرکەزی ئیسلامیان لێئـەکردین، بۆئەوەی سـەردانمان بکـەن و دەربـارەی ئیسـلام پرسـیارەکانیان بکـەن و ئامـادەی خوتبـەکانی هـەینی ببن... لەوێدا تێگەیشتم خـوا کـاری بـێ حیکمەت نیە، باعەقڵی کوڵی ئێمەش ئەو کارە نەبڕێت.

-ڕۆژی ١٦ی سێپتێمبەر بانگەوازێکمانکرد بەناوخەڵکدا بۆ سـەردانیکردنی مەرکەزەکـەمان، لـەو بڕوایـەدا بـووین سـەد کەسـێك ئامـادە نـابێ، کەچـی زیـاد لەهـەزار کەسـیش ئامـادەبوون لــەدەرو دراوسـێکمان و پیـاوانی ئـاینی و مامۆستایانی زانکۆ، باسێکی وردی ئیسلاممان بۆکردن و

قورئانمان بۆ خوێندنەوە، هەر ئەو ڕۆژە دەعوەتێکیان پێدام لەکەنیسەکەی رۆژی پێشووترەوە کەبچم وتاربدەم و باسی بنەماکانی ئیسلام بکەم بۆ خەڵکی، لەپێنج کەناڵی تەلەفزیۆنیشەوە بانگهێشتکراین بۆ پرسیارو وەلام و قسەکردن دەربارەی ئیسلام !.

–ڕۆژی ١٩ی سێپتێمبەر لەلایەن عومدەی شارەکەی دراوسێمانەوە بانگهێشتکراین بۆ ئەوەی لەبەردەم هەزاران کەسدا باسی ئیسلامیان بۆ بکەین کە بۆ ئەو مەبەستە کۆیانکردبوونەوە .

–ڕۆژی ٢٠ی سێپتێمبەر سێ سەد مامۆستاو قوتابی زانکۆی هارفارد هاوڕێ لەگەڵ سەفیری ویلایەتە یەککگرتووەکان لەڤێننا هاتن بۆ سەردانیکردنی مەرکەزی ئیسلامی و لەگۆڕەپانی مزگەوتەکەدا دانیشتن و باسی ئیسلاممان بۆ کردن و قورئانمان بۆخوێندنەوە، سەیر ئەوەبوو ئەمانیش فرمێسک بەچاوەکانیاندا ئەهاتەخوارەوە!

–ڕۆژی جومعە ٢١ي سێبتێمبەر موسڵمانان لەگەڵ حاکمی ویلایەتی(ماستشوستس) کۆبوونەوەو قسە لەسەر ئەوە کرا کە لەبەرنامەی خوێندندا وانەیەك تەرخانبکرێ بۆ دینی

ئیسلام، تاببێتە مایەی هۆشیاری و کەس دژایەتی ناڕەوای موسـڵمانان نـەکات، وتـارو نوێـژی جومعەکـەش لەکەناڵی(CNN) بە تـەواوی بڵاوکرایـەوە، هـەروەها وتـاری هەفتانـەی شـەوی مەرکەزەکـەشمانی بڵاوکـردەوە! بەڕاستی ئەمانـەی لەشـاری بوسـتن ڕوویانئـەدا لەهـەموو شـارەکان بەشێوازێك لەشێوازەکان ڕوویانـدا و بۆماندەرکەوت (ئیسلام نـەك پاشەکشـە ناکـات بـەڵکو پێشـکەوتنی گەورەشـی دەستکەوتووەو ئەوەی ئێمە واماندەزانی ئیسلام پەنجا ساڵ لەئەمریکادا هاتەدواوە، وا دەرنەچوو، بەڵکو لەسایەی خواوە بەو یازدە ڕۆژەی دوایی ١١ی سێپتێمبەر ئیسلام یازدە ساڵ چوویە پێشەوە[٦٧].

- سەرۆکی کۆمەڵەی موسڵمانان لەهاوای ـ کە پەنجایەمین ویلایەتی ئەمریکایە ئەڵێ: (پێش ڕووداوی ١١ی سێپتێمبەر لەمانگێکدا (٣) سێ کەس موسڵمان دەبوون، کەچی لەماوەی سێ هەفتەی دوای ئەو ڕووداوە (٢٣) کەس موسڵمان بوون،

[٦٧] المعجزة المتجددة ، ل ١٦٦ .

ك زۆربەیان ئافرەتن.. یەكێك لەوانە ئەڵێ: (من ئەمڕۆ یان سبەی هەر دەمرم بۆیە پێویستە موسڵمان ببم).

– لەفەرجینیا مەركەزی ئادەم پێشوازیكرد لەقەشەیەك و دە ئەمەریكی كە موسڵمان بووبوون، چەند ڕۆژێك دوای ١١ی سێپتێمبەر دراوسێكانی مزگەوت هەڵمەتێكی پارە كۆكردنەوەیان دەستپێكرد بۆ نەوژەندكردنەوەی مزگەوتەكەمان كەهەندێ توندڕەوی جولەكەو گاور زیانیان پێگەیاندبوو[٦٨].

– موسڵمانێكی ئەو شارە ئەیگێڕێتەوەو ئەڵێ: ڕۆژێك زۆر ترسم ایێنیشت لەكاتی چوون بۆ مزگەوتدا بە تایبەت من ساڵێك بوو موسڵمان بووبووم، شەو دوعای زۆرم كرد كەخوای گەورە ترس لەدڵماندا نەهێڵێ .. سەیر ئەوە بوو كە چووم بۆ مزگەوت سەیرئەكەم دەرگای مزگەوت بەچەپكە گوڵ ڕازابوەوە لەلایەن دەرو دراوسێی مزگەوتەكەوە، وەك دەربڕینی هاوسۆزیەك، بەڕاستی ئەمەش مژدەیەكەو

[٦٨] سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٧ .

ئامارەکات کە داهاتوو بۆ ئیسلامەو لەئەمەریکاداو لەجیهانیشدا .

- ئامارەکان دەلێن ژمارەی ئەوانەی موسلمان دەبن چوار ئەوەندەی ئەوانەن کە پێش ڕووداوی ١١ی سێبتێمبەر موسلمان بوون .

-ڕاپۆرتێکی (CIA) ئامارێك ئەکات و ئەلێ: (ئیسلام لەهەموو ئاینەکانی تر خێراتر بلاوئەبێتەوە، ژمارەی موسلمانان دەگاتە سێ یەکی دانیشتوانی جیهان)، واتە (لە هەر سێ کەسێك یەکێکیان موسلمانە)و ڕێژەی موسلمانبوونیش دوای کارەساتی ١١ی سێبتێمبەر زۆر زیادیکردووە)، ڕاپۆرتەکەی (سیا) نیگەرانی لەبلاوبوونەوەی خێرای ئیسلامدا دەردەبڕێ بەتایبەت لەئەمەریکاو ئەورووپاو ئوسترالیادا[٦٩] .

لەمانەو جگە لەمانەوە ئەگەینە ئەوەی کە ئەو پیلانانەی دانراون بۆ کوژاندنەوەی ئیسلام هەموو شکستیانخواردووەو بەری ڕۆژی ئیسلامەتی بەبێژنگی هیچ پیلانگێرێك ناگیرێت و

[٦٩] هەمان سەرچاوە ، ل ٢٠٩.

ئیسلام بەڕێوەیەو هاکا هاتەوە، چونکە بەدیلی تەنیا بۆ ئەم مرۆڤەو ئەم ژیانە تەنیا بریتییە لەئیسلام و تەنیا ئیسلام ئەتوانێت پێشبگرێت لەو قووڕبەسەرییەی کە سیستەمە ستەمکارەکانی ئەمڕۆ گرتوویانەتەوە بۆ ئەم مرۆڤە هەژارە ..

## سەرچاوەکان


- القران الكريم
- الحجاب و تأثيره على صحة و سلامة الشعر: د.محمد ندا ، بكة.
- سنن الترميذي،الترميذي
- مصنف ابن ابي شيبة: ابن ابي شيبة.
- سنن ابي داود، ابوداود.
- سنن البيهقي، البيهقي.
- مُخْتَصَرُ النَّصِيحُ فِي تَهْذِيبِ الْكِتَابِ الْجَامِعِ الصَّحِيحِ، المهَلَّبُ بنُ أَحْمَدَ بنِ أَبِي صُفْرَةَ أَسِيْدِ بنِ عَبْدِ اللهِ الأَسَدِيُّ الأَنْدَلُسِيُّ،المحقق: أَحْمَدُ بْنُ فَارِسٍ السلوم.
- لكتاب المصنف في الأحاديث والآثار، أبو بكر بن أبي شيبة، المحقق: كمال يوسف الحوت.
- جلباب المرأة المسلمة في الكتاب والسنة، محمد ناصر الدين الألباني.
- روضة المحبين، ابن القيم
- زاد المعاد، ابن القيم
- الأيام النظرة والسيرة العطرة لرسولنا صلى الله عليه وسلم)، صالح بن عواد المغامسي.
- الرحيق المختوم، المباركفوري.
- إنسان العيون في سيرة الأمين المأمون، علي الحلبي.

- السيرة النبوية، ابن كثير
- نوراليقين، الخضري بك
- فقه السيرة، محمد الغزالي
- فقه السيرة، البوطي
- السيرة النبوية، الصلابي
- الرسول القائد، محمود شيت الخطاب
- المختصر الكبير فى سيرة الرسول الامين، الكتاني
- بداية سيرة الرسول، محمد بن غبدوالوهاب
- حدائق الأنوار ومطالع الأسرار فى سيرة النبى المختار، ئـةلبحرقي الشافعي
- شهد الكلام في سيرة خير الانام، بهجت بن فاضل بن بهجت.
- بلوغ المرام، ابن حجر
- في ظلال القران، سيد قطب.
- شرح السنة، البغوي.
- مختصر منهاج القاصدين، المقدسي.
- مجمع الزوائد، الهيثمي.
- بدائع الفوائد، ابن القيم.
- الفرقان بين اولياء الرحمن و أولياء الشيطان، ابن تيمية.
- ثياوان و ذنان تةواوكةري نايةكسان، ابراهيم طاهر.

- المراة الجديدة ، قاسم امين.
- معركة التقاليد، محمد قطب.
- منهاج السنة، ابن تيمية.
- دراسات اسلامية، سيد قطب.
- المسند، الإمام أحمد.
- الرسالة، الشافعي.
- نهج البلاغة، ص٦٩٣
- مجموعة الرسائل الامام الشهيد حسن البنا.
- السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية، ابن تيمية.
- المعجزة المتجددة،ابو عبدالرحمن اليافي.
- بەرەو ئیسلام ، ئاسودەیی ، ئەندازیار عوسمان.

